

محەمەد ڕەئوف



# پاکیزەکانی ئەنفال

## لێکۆڵینەوەیەک لە سەر کچە فرۆشراوەکانی ئەنفال

لەیادی ٢٦ساڵەی تاوانی ئەنفالدا

ناوی کتێب: پاکیزەکانی ئــەنفال

ناوی نووسەر: محەمەد ڕەئوف

دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٣٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٣١٥ ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

سەرپەرشتیاری زنجیرە کتێبەکان: بەختیار سەعید

چاپ: چاپخانەی کەمال

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان ٢٠١٤

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم



لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسوڵ) چاپکراوە

محەمەد رەئوف

# پاکیزەکانی ئەنفال

## لێکۆڵینەوەیەك لە سەر کچە فرۆشراوەکانی ئەنفال

# پێڕست

## پێشەکی

فرۆشتن و دەستدرێژیکردنە سەر کچان و ژنانی ئەنفاڵ، لە پرۆسەکانی ئەنفالدا کە لە کۆتایی مانگی شوبات تا سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٨٨ ی خایاند، یەکێکە لە پڕ مەترسیدارترین ئەو پرسانەی کە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر سایکۆلۆجیەتی تاکی کوردی بە تایبەتیش ژنان و کچانی قوربانیدەری ئەو پرۆسەیە دروست کردووە، لەگەڵ ئەوەی ئەم پرسە کەمتر لە ناوەندە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کوردستاندا قسەی لەسەر کراوە، لەلایەك بە هۆی هەستیاری پرسەکەوە لە رووی کۆمەلایەتیەوە، بەوەی تاکی کوردی مەسەلەی شەرەف و ناموس و دەستدرێژی بە هێڵی سوور ناو دەبات و بەردەوام لە چوارچێوەی پرسە شاراوەکانە، لە لایەکیش بە هۆی بە دوادا نەچوون و گرنگیدانی دامودەزگا پەیوەندیدارەکان بۆ ئەو پرسە، ئەمە وای کردووە کە کەمترین بەدواداچوون و گفتوگۆی لەسەر بکرێت.

ئەنفال وەك پرۆسەیەکی نەخشە بۆ داڕێژراوی رژێمی بەعس، لەگەڵ کوشتن و لەناوبردنی هەزاران مرۆڤی کورد لە ژن و منداڵ و پیرو گەنج، بە هەزاران رەز و باخ و مەر و ماڵاتی لەناوبردوو سەرەڕای وێرانکردنی سەرجەمی خاکی گوندنشینی کوردستان، بە تەواوی ژینگەی کوردستانی تێکدا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو زیانە مادی و مەعنەوییەی کە پرۆسەی ئەنفال بەسەر گەلی کوردا هێنای، رژێمی بەعس لە پرۆسەی ئەنفالدا لەهەوڵی تێکشاندنی تاکی کورددا بووە، چ لە رووی کوشتن و ترساندن و ئەشکەنجەدانەوە، چ لە رووی دەستدرێژیکردنە سەر کچان و ژنانی ناو زیندانەکان و فرۆشتنیان بە ئەفسەر و سەرۆك عەشیرەتەکان.

لێکۆڵینەوەی ( پاکیزەکانی ئەنفال ... لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە کچە فرۆشراوەکانی ئەنفال ) کە تایبەتە بە لێکۆلینەوەی ئەو کچ و ژنانەی ئەنفال کە فرۆشراون بە ئەفسەر و سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوخۆی عێراق و میسر و سعودیە و

ولآتانی کەندا و لەگەڵ دەستدرێژیکردنە سەریان لەناو زیندانەکانی دبس و تۆپزاوا و نوگرە سەلمان، ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوەیەکی وورد بەدواداچوون دەکات بۆ ئەو پرسە و بەشێوەی سەرەکی پشت دەبەستێت بە چاوپێکەوتنی شایەتحاڵەکان، لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەی کە خراونەتەڕوو.

ئەو لێکۆڵینەوەیە لە دوو بەش و چوار تەوەر پێك هاتووە، لە تەوەری یەکەمدا چەمکی ئەنفال روونکراوەتەوە وەك چەمکێکی قورئانی کە رەگوڕیشەیەکی عەرەبی هەیە،چەمك و زاراوەی قورئان بە شێوەیەکی وورد روونکراوەتەوە، لەگەڵ پێناسەی پرۆسەی ئەنفال، بەو پێیەی ئەو پرۆسەیە پرۆسەیەکی پلان بۆدارێژراو بووە لەلایەن رژێمی بەعسەوە بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، ئەمە سەرەرای خستنەڕووی قۆناغەکانی ئەنفال و ئەو ئامارو داتایانەی لەسەر ئەنفالکراوان خراوەتەڕوو کە ئایا ۱۸۲ هەزار ژمارەیەکی راستە یاخود سیاسی، ئەی ژمارەی راستەقینەی ئەنفالکراون چەندە..؟؟؟

تەوەری دووەمی لێکۆڵینەوەکە تەرخان کراوە بۆ بەراوردکردنی نێوان ئەنفال و دەرسیم، بەوەی دەیان خاڵی لێکچوو هەیە لە نێوان کۆمەڵکوژی دەرسیم و تاوانی ئەنفال، چ لە ڕووی نەخشەو پلان و هەوڵی لەناوبردن، چ لە رووی شێوازی کۆمەڵکوژیەکان ، لە نێوان ئەنفال و دەرسیم، چ لە رووی ئەوەی لە هەردوو پرۆسەکەدا گوندنشینان کرانە ئامانج، بەڵام ئەوەی زیاتر وای کرد بەراوردی ئەنفال بە دەرسیم بکرێت، لە هەردوو پرۆسەکەدا ژنان و کچان بوونەتە قوربانی دەستدرێژی سەربازان و ئەفسەرانی سوپا، کە خاڵی جەوهەری لێکۆڵینەوەکەیە.

لە بەشی دووەمدا باس لە دۆخی ژنان دەکات لە پرۆسەی ئەنفالدا، لە تەوەری سێیەمدا ئاماژە بە بارودۆخی ژنان کراوە لە پێش ئەنفال و ناو ئەنفالدا ، بە تایبەتیش دۆخی ژنان لەناو زیندانەکاندا، کە چۆن دەستدرێژی کراوەتە سەر کچان و ژنان و چ کاریگەریەکی گەورەی لە سایکۆلۆجیەتی ژناندا جێهێشتووە، هاوکات

هەر لە تەوەرەی سێیەمدا بە ووردی باس لە فرۆشتنی کچان کراوە، لەسەر دوو ئاست، لە ئاستی یەکەم، فرۆشتنی کچان بە ئەفسەر و سەرۆك هۆزەکانی ناوخۆی عێراق، لە ئاستی دووەم فرۆشتنی کچان بە ولاتانی عەرەبی، کە چەندین چاوپێکەوتن و بەڵگەنامەی تیادا خراوەتە روو بۆ سەلماندنی فرۆشتنی کچانی کورد بە وڵاتانی عەرەبی، لەگەڵ لێکۆڵینەوەی ورد لە بەڵگەنامەی فرۆشتنی ١٨ کچی ئەنفال بە میسر و، خاڵە درووست و نادرووستیەکانی خراوەتەڕوو، لەگەڵ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە زۆربەی نادی کلاپەکانی میسر گەراون بۆ بەدواداچوونی کچانی ئەنفال، لە تەوەری چوارەمدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە و پێشنیاز و راسپاردەکان خراوەتەڕوو لەگەڵ سەرچاوە و پاشکۆکان.

دەست بردن بۆ بەدواداچوونی پرسێك سەبارەت بە دەستدرێژی سەر کچان و ژنانی ئەنفال و فرۆشتنیان، کارێکی قورس و هەستیارە، لە لایەك بەهۆی هەستیاری پرسەکە کە پرسێکی کۆمەڵایەتیە و لە کۆمەڵگەی کوردیدا یەکێکە لە هێڵە سورەکان، لە لایەکی تریش قسەنەکردنی ئەو کەسانەی کە رووبەڕووی ئەو دەستدرێژیە بوونەتەوە، هاوکات نەبوونی بەڵگەی روون و سەلمێنەری وورد لەسەر ئەو پرسە، یەکێکی ترە لە گرفتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لەگەڵ ماندوبونێکی زۆر لەم لێکۆڵینەوەیەدا، هیوادارم لە ئاستی پرسێکی ئاوا گەورە و هەستیاردا بێت، دڵنیاشم هیچ شتێك بێ کەموکوڕی نابێت.

محەمەد رەئوف

٢١ی ئازاری ٢٠١٤ – سلێمانی

## یەکەم/ چەمکی ئەنفال

ڕژێمی بەعس سەرجەم جەنگ و هێرش و پەلامارەکانی بە پلانی ورد و نەخشە بۆدارێژراو ئەنجام دەدا و لە سەرجەم ڕووەکانیەوە ئامادەکاری بۆ دەکرد، بەعس هەر پرۆسەیەك کە خزمەتگوزاربێت ناوی بەعس و سەرۆك و شۆڕشی لێ دەنان وەکو" مەدینە صدام ، سد صدام ، مستشفی صەدام ، نهر القائد ، حی الثورة ، حی البعث " ، هەر پرۆسەیەکیش کاولکاری و دڵەڕاوکێ و ترس و کارەساتی بە دواوە بێت ئەو ناوی دەنان ( الله اکبر ، محمد رسول الله ، قادسیة و موشەکەکانی عەباس و حوسەین) ئەوانەی کە جێگای ڕێزی موسڵمانان و وڵاتە دراوسێکانی بون بۆ ئەوەی چاوبەستێك لە لایەنگرانی بکات و وایان تێبگەیەنێت کە ڕژێم خەلافەتی ئیسلامی زیندوو دەکاتەوە و ئەو میللەتەش کە بەناوی کورد ،دژی دەجەنگێت میللەتێکی یاخی و دوور لە دینە.

بێگومان ناونانی ئەم پرۆسەیە بە ناوی ( ئەنفال )ەوە بە هەمان شێوە بەشێکە لە پلانە سەرکوتکەرەکانی و بۆشەرعیەتدانی زیاتر بە تاوانەکانی ، بۆیە پرۆسەی ناولێنان لە فەرهەنگی بەعەسدا ئەزموونێکی دێرینی هەیە،

بۆ نموونە ئەو موشەکانەی ئێرانی شیعە مەزهەبی پێ بۆردوومان دەکرا ناوی " الحسین و العباسی " لێدەنان ! ! ! گەڕەکە کوردەکان ناوی موسەنای لێ دەنان، ئەو سەربازگەیەی خەڵکی کوردی تیا بەند دەکرا ناوی " خالیدی کوڕی وەلیدی " لێدەنا .١

ئەنفال کە وشەیەکی عەرەبیە و خوێندنەوە و لێکدانەوەی جیاواز هەڵدەگرێت و زۆرێك لە ڕافەکاران و زانایانی ئایینیش لێکدانەوەی جیاوازی بۆ دەکەن، بەو پێیەی ئەنفال، لەگەڵ ئەوەی زاراوەیەکی قورئانیە، بەڵام بنەڕەتێکی عەرەبی هەیە و وشەکە بۆ پێش هاتنی ئیسلام دەگەڕێتەوە، ئەنفال کۆی وشەی ( نفل ) بە واتای (غنیمە) دێت کە کۆی وشەی ( غنائمە).٢

هەندێك لە زانایان پێیان وایە وشەیەکی عەرەبیە و بە واتای دەستکەوت دێت، کە لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلامدا عەرەبەکان وشەی ( ئەنفال ) یان بە واتای تاڵان و برۆیی جەنگ بە کار هێناوە. ٣

بۆیە زانایان لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە بۆ وشەکە و هەندێکیان پێیان وایە( غەنیمە)و (ئەنفال) یەك شتە ، بەڵام بە جیاوازی ئیعتباری ناوەکە دەگۆڕێت :

- ئەگەر ئەو ئیعتبارەی بخوێنینەوە کە دەسکەوتە ئەوا پێی دەوترێت (غەنیمە).
- ئەگەر ئەو ئیعتیبارەی بخوێنینەوە کەماڵێکی زیادەیە ئەوا پێی دەڵێن (ئەنفال ) .

کەواتە هەمیشە ئەنفال ئەو کاڵا زیادەیەیە کە پاش دابەشکردنی دەستکەوت (غەنیمە) دەمێنێتەوە .

هەروەها (راغب الاسفهانی) لە (الالفاظ القران)دا بەم مانایانەی خوارەوە بنەڕەتی وشەی ئەنفالی دەرهێناوە :.

١- هوالغنیمة بعینها ولکن اختلفت العبارة عنه باختلاف الاعتبار .

٢- الغنیمة : ما حصل مستغنما بتعب کان او غیر تعب وباستحاق کان او غیر استحاق .

٣- وما یحصل للمسلمین بغیر قتال وهو الفیء . ٤

گەر بنوارین لە یەکەمیاندا ئەنفال بە واتای دەستکەوت (غەنیمە) دێت .لە دووەمیاندا ئەنفال بە واتای (غەنیمە) دێت کە بەناڕەحەت دەست بکەوێت یان بە ئاسانی . بەڵام لە سێیەمیاندا بە واتای ئەو دەستکەوتەیە کە بەبێ کوشتار دەستی موسلمان دەکەوێت .

هاوکات ئەحمەد بەدەوی شاعیریش لە دێڕە شیعرێکدا کە بۆ جەنگی بەدر وتویەتی ئەنفال بەم مانایە لێکدەداتەوە و دەڵێت:

وفيئهم الفيء في القتال		مالم يكن اخذ من القتال

اما الغنيمة ففي الزحافي		والقتل عنوة لدى زحاف ٥

بەلأم سەبارەت بە هاتنی وشەی ( ئەنفال ) لە قورئاندا ، ئەنفال ناوی سورەتی هەشتەمە لە قورئانی پیرۆز و زەمینەی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتە دەگەڕێتەوە بۆ سالّی دووەمی کۆچی و جەنگی بەدری گەورە کە لە نێوان موسلّمانەکان و بێباوەڕاندا روویدا و موسلّمانان بەسەریاندا سەرکەتن ، راڤەکارانی قورئانی پیرۆز زۆرینەیان هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر (د.خ) بینی هاوەلأنی ناکۆکی و کەوتوّتە نێوانیان لەسەر ئەو کەلوپەل وشمەکانەی کە لە سوپای بێباوەڕان جیّ ماوە ، بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە خوای گەورە ئەم سورەتەی دابەزاند کە لە سەرەتای سورەتەکەدا هاتووە ( يسألونكَ عن الانفال قلِ الانفال لله والرسول فالتقوا الله واصلحوا ذات بينكم ).٦

وەك ئەوەی لە قورئاندا هاتووە، زانایانی ئاینی پێناسەیان بۆ ئەنفال کردووە و دەلّێن: هي الاموال ماخوذة من الكفار قهرا بقتال )

لەم پێناسەیەوە سیّ ئەنجام دەستگیر دەبێت:

١. ئەنفال ( اموال ) ە واتا شتومەك هەر وەکو لە هەمان سورەتی ( الانفال ) دا خوای گەورە پێناسەی دەکات بە ئایەتی ( واعلموا انما غنمتم من الشيء ..) چونکە ( شیء ) بە شتومەك دەوترێت.

٢. ( من الكفار ) واتا لە بێباوەرانی جەنگاوەر.

٣. ( قهرا بقتال ) واتا شتومەکەکان، شتی بەجێماوی مەیدانی جەنگە، نەك هی مالّ و نێو لادیّ و شارەکان، ئەم شتومەکەی مەیدانی جەنگیش کە پێی دەوترێت ( غنيمه ) واتە دەستکەوت، لە پێش ئیسلامدا و لە ئایینەکانی پێشودا، رێگە نەدراوە بە کەس هەلّیان بگرێتەوە، بۆیە لەیەکەم جەنگی نێوان موسولّمانان و بێباوەرانی

عەرەبدا هاتە ئاراوە، بۆ ئەو ساتووەختە شتێکی نوێ بوو، بۆیە موسولمانان نەیاندەزانی ئەو شتومەکانە هەڵبگرنەوە یان نا. ٧
لێرەوە دەردەکەوێت کە ئەنفال لە قورئاندا مەبەست لێی کەلوپەل و شتومەك دەگرێتەوە و مرۆڤ ناگرێتەوە، چونکە لە قورئاندا بە دەستگیرکراوی جەنگ دەوترێت دیل (ئەسیر) هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێت ( ویطعمون الطعام علی حبه مسکیناً ویتیماً واسیراً ) ٨.

هەروەها دابەشکردنی ئەو دەستکەوتانەی لە مەیدانی جەنگ دەگیرێن و دابەشکردنیان روانینی جیاوازی بە دوای خۆیدا هێناوە، هەر چەندە خوای گەورە لە سورەتی ئەنفالدا دیاریکردووە( والعموا انما غنمتم من شیء فان لله وللرسول و لذی القربی والیتامی والمسلمین)، حەنەفیەکان پێیان وایە ( نفل ) خەلیفەی موسڵمانان دەتوانێت بەشێك لە دەستکەوتەکان بداتە کەسێك، بەتەنها کافرێکی کوشت ،کەلوپەلەکەی بۆ خۆی یان ئەو کەسانەی ئەو شارە بگرن، هەرچی دەستیان کەوت بۆ خۆیان، بەڵام رای مالیکی ئەوەیە کە نەفل بەو کەسانە دەدرێت کە شەڕی چاکیان کردووە، لە پێنجیەکی غەنیمەدا، چونکە چوار لە پێنج بۆ لەشکرە و بەسەریاندا دابەشدەکرێت، بەڵام حەنبەلیەکان دوو روانینیان هەیە سەبارەت بە نەفل، یەکەمیان :پێیان وایە ئەگەر لەشکر لە هێرشکردن گەڕانەوە و هەندێك کەس دەستکەوتیان زۆر بوو هەندێکیشیان کەم بوو ئەوا دروستە سەرلەشکر شتی زیاتر بداتە ئەوانەی دەستکەوتی زۆریان هێنابووەوە، دووەمیان: پێیان وایە کە دروستە سەرلەشکر بڵێ ئەو کەسەی کافرێك بکوژێت فڵان شتی دەدەمێ و ئەوەی سەنگەرێك بگرێت، ئەو شتەی دەدەمێ، بەڵام بۆچونی شافیعیش دوو جۆرە، یەکەمیان: ئەگەر جەنگاوەرێکی موسلمان جەنگاوەرێکی کافری لە کاتی شەڕدا کوشت ئەوا جلوبەرگو کەلوپەلەکانی بۆ خۆیەتی، خۆ ئەگەر بە دوو کەس کوشتیان ئەوا بۆ هەردووکیانە، دووەمیشیان :پێیان وایە کە خەلیفە بۆی هەیە بە گوێرەی پێویست هەندێك کەس خەڵات بکات لە بەشی پێغەمبەر، چونکە دەستکەوتەکانی

شەڕ کۆدەکرێتەوە ( بەپێی ئایەتەکە ) پاشان دەکرێت بە پێنج بەش، چوار بەشی بەسەر جەنگاوەراندا دابەشدەکرێت و بەشێك دەمێنێتەوە ئەویش دەکرێت بە پێنج بەش، لەوەش چوار بەش بۆ خاوەنەکانی خۆیانن و بەشێك دەمێنێتەوە، کە پێی دەڵێن بەشی پێغەمبەر، تەنها لەو بەشەدا خەلیفە دەتوانێت خەلات و بەخشش (ئەنفال ) بدات. ٩

لێرەوە زانایان رای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە ناساندنی وشەی ئەنفال ، بەلام دەتوانین بڵێین ئەنفال بەو ماڵ و سامان و ئاژەڵ و زەخیرانە دەوترێت کە جەنگاوەرانی موسڵمان لە شەڕدا لە بێبڕوایان بەدەستی دەهێنن .

بەپێی روانینی زانایان و ئەو خوێندنەوە و شیکاریانەی کە بۆ وشەی ئەنفال کراوە، ئەنفال مرۆڤ ناگرێتەوە و تەنها شتومەك و کەلوپەلی جەنگ دەگرێتەوە، بەو پێیەی لە قورئاندا مرۆڤ بە ئەنفال ناو نابرێت، بەڵکو لە قورئاندا بە ( ئەسیر ) ناوی هاتووە، هەر بۆیە مەرجەکانی ئەنفال بریتین لە :.

١- ئەنفال بەو دەستکەوتانە دەوترێت کە لە مەیدانی جەنگدا دەگیرێ و ماڵ و سامان و چەك و زەخیرە دەگرێتەوە و بەکالا و شمەکی دەسکەوتوو دەوترێت .

٢- لەهەمان کاتدا دەبێت ئەو دەستکەوتانە بە شەڕ و لەمەیدانی جەنگدا بگیرێت.

٣- هەروەها دەبێت ئەو دەستکەوتە لە کۆمەڵێکی بێباوەڕ و کافرو دوور لە دین بە زاراوەی شەرعی نەك بەگوتەی سەرزاری خەڵك و کاربەدەستان .١٠

## دووەم/ پرۆسەی ئەنفال

پرۆسەی ئەنفال پرۆسەیەکی فراوان و گەورە و فرە رەهەندە و دەکرێت زیاد لە رەهەندێکەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر بکەیت و لێکدانەوەی بۆ بکەیت، بەو پێیەی پرۆسەکە لە کۆتاییەکانی شوبات تا سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٩٨ی خایاند و تیایدا بە هەزاران ژن و پیاو و گەنجی کوردی تیادا لەناوبرا و زیانێکی ماددی گەورەشی لە ژینگە و سروشتی کوردستان دا، بەڵام ئەو پرۆسەیە هەروا بە ئاسانی جێبەجێنەکراوە، بەڵکو بە پلان و بەرنامەی وردی نەخشە بۆکێشراوەوە جێبەجێکراوە.

کەواتە پرۆسەی ئەنفال ئەو پرۆسەیەیە کە رژێمی بەعس ، بە پلان و ئامادەکاری تەواوەوە بەرامبەر بە میللەتی کورد پیادەی کرد بە ئامانجی سڕینەوە و لەناوبردنی مۆرکی نەتەوایەتی گەلی کورد و لەناوبردنی هەموو شوێنەوارێکی کولتوری و ناسنامەی میللەتی کورد.١١

مەبەست لە پلان و نەخشە بۆداڕێژراو ئەوەیە کە رژێمی بەعس، لە ناونانی پرۆسەکە بە ( ئەنفال ) و لە دانانی کەسەکان و راگواستنی بەشێکی زۆری قەزا و ناحیەکان لە پێش پرۆسەکە و دابەشکردنی تەواوی کوردستان بۆ شەش ناوچەی جوگرافی و هەشت قۆناغ بۆخۆی پلاندانان بوو بۆ پرۆسەی ئەنفال، هەر بۆیە پرۆسەی ئەنفال دەچێتە چوارچێوەی ( جینۆساید ) * ەوە، بەو پێیەی جینۆساید، تاوانێکی نەخشە بۆکێشراوە، بۆ ئەنجامدانی سیاسەتێکی دیاریکراو کە بونیادی هاوبەش و بوونی کۆمەڵە مرۆڤێك تەفروتونا دەکات.

* وشەی جینۆساید بۆ یەکەم جار زانای یاسایی پۆڵۆنی (رامابێل لمکین) لە ساڵی ١٩٤٤ لە کتێبەکەیدا بە ناوی ( یاسای میحوەری لە داگیرکردنی ئەوروپادا )

ئەم وشەیەی بە کار هێناوە کە تا ئەو کاتە ئەم وشەیە لە هیچ فەرهەنگ وئینسکلۆبیدیایەکدا بە کار نەهێنرابوو.

جینۆساید لە رێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆ قەدەغەکردنی جینۆساید کە لە ٩/کانونی دووەم/١٩٤٨ مۆر کراوە بەم شێوەیە پێناسەی کراوە( بریتییە لەو کارانەی بە مەبەستی تێکدان و هەڵتەکاندنی گشتی یان بەش بەش ئەنجام بدرێت دژ بەکۆمەڵێکی نەتەوەیی ، ئەتنیکی ، نەژادی ، ئاینی و شتی لەم چەشنە ) .

لەم پەیماننامەیەدا جینۆساید بە مانای هەر یەك لەم کردەوانەی خوارەوە دێن:

أ- کوشتنی ئەندامانی گروپەکە .

ب- زیانگەیاندنی زەینیی جددی بەئەندامانی کۆمەڵگە .

ج- بە ئەنقەست دانانی گروپێك لەژێر بارودۆخێکی وا کە بە بژاردە تەواوی گروپەکە یان بەشێکی ، لە باری فیزیکییەوە لەناو ببات .

و- داسەپاندنی ئیجرائاتی وا کە بە مەبەستی پێشگرتن بێت لە زان ( منداڵبون) لەناو گروپەکە .

ه- بەزۆر راگواستنی منداڵانی گروپەکە.

ئەم پەلامارەش سەرجەم ناوچە گوندنشینەکانی گرتەوە و بۆتە هۆی روخاندنی هەموو گوندەکانی کوردستان و بێسەروشوێن کردنی هەزاران مرۆڤی بێتاوانی کورد، (میدڵ ئیست وچ) پێی وایە کە :( ئەنفال ئەو ناوە بوو کە بە زنجیرەیەك هێرش و پەلاماری چڕوپڕی سەربازیدا درا ، کە سەرجەم هەشت پەلاماربووە لە شەش ناوچەی جوگرافیای جیاوازدا بەڕێوە چوو ، لەنێوان کۆتایی مانگی شوبات و سەرەتای ئەیلولی ١٩٨٨دا ، فەرماندەی گشتی عەمەلیاتەکە لە دەستی نوسینگەی

باكوری رێكخراوی حیزبی بەعسدا بوو ، كەوا بنكەكەی لە شاری كەركوك بوو، لەمارتی ۱۹۸۷ بەدواوە لەلایەن (عەلی حەسەن مەجید)ەوە سەرۆكایەتی دەكرا).۱۲

دیارە پرۆسەی ئەنفال پرۆسەیەك نیە هەروا بە ئاسانی و لەخۆوە دروست بوو بێت بەڵكو نیەت و پلانەكەی بۆ پێش دەستپێكردنی پرۆسەی ئەنفال دەگەڕێتەوە، هەروەك نوسەرێ گەورەی عێراقی كەنعان مەكیە دەڵێت: ئەنفال رووداوێك نیە كە لە ئاسمانەوە كەوتبێتە خوارەوە، بەڵكو مێژوویەكی درێژی مامەڵەكردنی دڵڕەقانەی كوردی لەلایەن بەعسەوە لە پێشەوەیە. ۱۳

لە یەكەم هەنگاودا بە ئاراستەی ئەنفالكردن و هەوڵی لەناوبردنی گەلی كورددا، پێش دەستپێكردنی شاڵاوەكانی ئەنفال رژێم خۆی بۆ ئەم پرۆسەیە ئامادە كردبوو. سەرەتای ئەم خۆ ئامادەكردنەش لە رۆژی ۱۹۸۷/ ۳/۱۸ دا بوو كە ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش ( مجلس قیادة الثورة ) و ( القیادة القطریة) لە كۆبونەوەیەكی هاوبەشدا بە تۆمەتی دەستەوستانی لە سەركوتكردندا ( سەعدی مەهدی صاڵح و محەمەد هەمزە زوبەیدی )یان لابرد و ( عەلی حەسەن مەجید)یان كرد بە (رازگری نوسینگەی باكوری حیزبی بەعس)( امین سر مكتب تنظیم الشمالی).۱٤

پاشان بەپێی بڕیاری ژمارە ( ۱٦۰)ی رۆژی ۲۹ /۳ / ۱۹۸۷ی ( مجلس قیادة الثورة)و بە ئیمزای رەسمی ( صەدام حوسێن) عەلی حەسەن مەجید دەسەڵاتی رەهای پێ بەخشرا لە ناوچەی باكووردا .

**( بڕوانە پاشكۆی ژمارە ۱ )**

لەگەڵ دەستبەکاربوونی عەلی حەسەن مەجید وەك رازگری نوسینگەی باکووری حیزبی بەعس، کەوتە پلاندانان بۆ وێرانکردنی گوندەکان و لەناوبردنی گوندنشینان، دەسەڵاتی تەواوی هەبوو بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی بەعس بەپێی بڕیاری ژمارە ( ٢٨ / ٤٠٠٨ ) کە لە ٢٠ / ٦ / ١٩٨٧ دا دەرچوو بەیەکجاریی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئیتر سیاسەتی کوشتن و وێرانکردن لە ٢٢ / ٦ /١٩٨٧ لە دێهاتە قەدەغەکراوەکاندا پیادە دکرێت ئەم بڕیارەش بە ئیمزای ( عەلی حەسەن مەجید) بە ناوی ( قيادة مكتب تنظيم الشالی ـ مكتب سكرتارية)وە دەرچووە و ئاڕاستەی فەیلەقەکانی( یەك ، دوو ، پێنج) ی سوپای عێراقی کراوە لە ناوچەکانی کوردستاندا .

( بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە ٢ ).

کورتکراوەی ئەم بڕیارەش بەم جۆرەیە :.

لەبەر ئەوەی بەڕەسمی راگەیەنراوە کە دوا کاتی کۆکردنەوەی دێهاتەکان لە ٢١ /٦/ ١٩٨٧ دا تێدەپەڕێت ، ئیتر لە رۆژی ٢٢ / ٦ /١٩٨٧ ەوە ئەم کارانە ئەنجام دەدرێت :.

١- ئەو دێهاتانەی هێشتا کەسانی ئاژاوەچیان (مخرب)یان تێدایە وەکو دێهاتی قەدەغەکراو دادەنرێت .

٢- ئەو دێهاتانەی وەکو ناوچەی شەڕ دادەنرێن بەتەواوی مرۆڤ و ئاژەڵیان تێدا قەدەغەیە ،سوپاش بۆی هەیە هەر کات بیەوێت بەئازادی تەقە و دەستڕێژیان لێبکات .

٣- هاتووچۆ بەتەواوی بۆ ئەو ناوچانە قەدەغەیە، وە هەموو جۆرە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەك لەو دێهاتانەدا قەدەغەن و لەژێر کۆنترۆڵدان.

٤- سوپا پێویستە هەر کاتێك بێت بۆردومان بکات و تۆپ و هەلیکۆپتەر و فڕۆکە بە کار بهێنێت، تاکو زۆرترین ژمارەی ئەو کەسانە بفەوتێنێت کە لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندان .

٥- هەر کەسێك لە گوندەکاندا بێت پێویستە بگیرێن و لە لایەن دەزگای ئاسایشەوە لێی بپرسرێتەوە، وە هەر کەسێك لەوانە تەمەنی لە نێوان ( ١٥ - ٧٠ ) ساڵ بێت لە دوای ئەوەی زانیاری تەاوی لێوەردەگیرێت، دەبێت ئیعدام بکرێت .

٦- هەر کەسێك خۆی تەسلیم کردەوە دەبێت لە ماوەی سێ ڕۆژدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت .

٧- مستەشارەکان و هێزی فەوجەکانی بەرگری میللی، جگە لە چەکی قورس دەست بەسەر هەموو شتومەکێکدا بگرن ، بۆ خۆیان دەبێت.

ئەم بەڵگەنامەیە خۆ ئامادەکردنێکی تەواوی ڕژێم پیشان دەدات بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەیەکی گەورەی لەناوبردن و جینۆسایدکردن وە هیچ جیاوازیەك ناکات لە نێوان گوندنشینێك و پێشمەرگەیەکدا هەموو بە ( مخرب) لە قەڵەم دەدات و بەبێ جیاوازی تەمەن و ڕەگەز پێویستە لەناو ببرێن .لەسەر بنەڕەتی بڕگەکانی ئەم بەڵگەنامەیە شاڵاوەکانی ئەنفال بەڕێوە چوو .

هەموو ئەو بڕیارانەی کە لەلایەن ( عەلی حەسەن مەجید )ەوە دەردەکرا ڕۆژانە لە لایەن یەکەکانی سوپاو دەزگا ئەمنی و حیزبیەکانەوە جێبەجێ دەکران ئەمیش بە تەواوی ڕێگە خۆشکردن بوو بۆ شاڵاوی ئەنفال و نزیکبوونەوە لە جێبەجێکردن و پیادەکردنی شاڵاوەکە .

## قۆناغەکانی جێبەجێکردنی شالاوەکانی ئەنفال

بۆیە رژێم لە ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ دەستی کرد بە پیادەکردنی پرۆسەکە و بەسەر ( ٨)قۆناغدا دابەشی کرد لە (٦ ) ناوچەی جوگرافیادا ( قۆناغی یەکەم بۆسەر ناوچەی دۆڵی جافایەتی ، قۆناغی دووەم بۆسەر ناوچەی قەرەداخ ، قۆناغی سێیەم بۆسەر ناوچەی گەرمیان ، قۆناغی چوارەم بۆسەر ناوچەی قەلاسێوکە و دۆڵی زێی بچوك ، قۆناغی پێنج و شەش و حەوت بۆسەر ناوچەکانی شەقلاوە و رەواندوز، قۆناغی هەشتەم و کۆتایی بۆسەر ناوچەی بادینان ). سەرجەم ئەم قۆناغانەش لە ٦ ی ئەیلولی ١٩٨٨ پاش روخاندنی هەموو گوندەکانی کوردستان کۆتایی هات .١٥

( بڕوانە نەخشەی ژمارە ١ )

**پرۆسەکانی ئەنفال**

**1988/2/22 تـــا 1988/9/6**



بۆ پیادەکردنی ئەم پرۆسەیەش رژێم هێزێکی گەورە و پرچەکی بە تازەترین و ترسناکترین شێوە بە کار هێنا، هێرش و پەلامارەکانی ئەنفال لە لایەن هێزە نیزامیەکانی هەردوو فەیلەقی یەك و پێنجەوە ئەنجامدران، بە پاڵپشتی یەکەی فەیلەقەکانی تر کە لە بەرەی شەڕی ئێراندا نەبوون، گاردی کۆماری هەڵبژاردەش بەشداری قۆناغی یەکەمی ئەنفالی کرد، ئەو یەکانەی تریش کە بەشداریان کرد، هێزی تایبەت( قوات الخاصه ) و هێزی کۆماندۆ ( مغاوير) و هێزی کوتوپڕ ( قوات الطوارىء ) .١٦

بەو پێیەش هەموو جۆرەکانی هێزی عێراق لە ئەنفالدا بەشداربوون، هێزی پیادە ( مغاوير)، ( قوات الخاصه )، ئالی، زرێپۆش، تانك، هێزی ئاسمانی، یەکەی تۆپخانە و کاتیۆشا، هەر یەکەیان ئەرکێکی پێ سپێردرا بوو، بۆ کاتی شەڕ و پەلامارەکان، هەموو جاشە کوردەکان ئەرکی دیاریکراویان بۆ دیاریکرابوو، مەفرەزە خاسەکانی ئیستخبارات، جاشەکانی سەر بە تەواری، فەوجی دیفاعی وەتەنی، لە یەکەم رۆژەوە تا دوا رۆژی ئەنفال لەگەڵ بوون. ١٧

لە پاڵ هێزە سەربازیەکانی حکومەتی عێراق، بەردەوام جاشەکان رۆڵی کاریگەریان هەبووە لە چاوساغی و پێشرەویکردنی سەربازانی رژێم، ئەوە راستیەکی مێژووییە کە لەو کاتەدا نزیکەی ( ٣٠٠ ) فەوجی خەفیفە لە کوردستاندا هەبووە، کە پتر لە ( ٢٠٠ هەزار ) چەکداری بەناو جاشی کوردیان تێدا کۆکرابوەوە، سەرانی ئەم فەوجە خەفیفانە بەتایبەتی سەرەڕای ئامر سریەکانیان و فەرماندەی مەفرەزە تایبەتیەکانی ئەمن و ئیستخبارات و چەکدارەکانیان، هەمیشە هاوکار و چاوساغ و یارمەتیدەری سوپای عێراق و رژێمی عێراق بوونە، بۆ جێبەجێکردنی تاوانەکانی ئەو رژێمە لە کوردستاندا، بەشێك لەوانە بەشداری راستەوخۆیان هەبووە لە جێبەجێکردنی هێرشەکانی ئەنفالدا. ١٨

## قۆناغی یەکەمی پرۆسەی ئەنفال

## لە ( ٢٢ /٢ تـــا ١٨ / ٣ / ١٩٨٨ )




**نەخشەی ژمارە ٢**

سنووری پەلاماری ئەنفالی یەك بریتی بوو لە دوکان ، بنگرد ، زێی بچوك، ماوەت، چوارتا ، ئەزمەر سلێمانی، سوسێ، سوورداش)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی دەستی پێکرد، ١٩ ئامانجی سەرەکی ئەم هێرشە بۆ وێرانکردن و لەناوبردنی (٢٥–٣٠) گوندی دۆڵی جافایەتی و داگیرکردنی بارەگای سەرکردایەتی، (ی،ن،ك) بوو، چونکە حکومەتی عێراق بۆیە شاڵاوی ئەنفالی لە دۆڵی جافایەتییەوە دەست پێ کرد، چونکە بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی و دەستگا سەرکردایەتیەکانی

تری یەکێتی نیشتیمانی و ئیستگەی رادیۆی دەنگی گەلی کوردستانی لێ بوو، عێراق پێی وا بوو تاکو سەرکردایەتی یەکێتی لەناو جەرگەی کوردستانی عێراقدا بێت، ئەوا ئەو ناتوانێت نەخشەی لەناوبردنی گوندنشینەکان وەك خۆی دەیەوێت ئاوا جێبەجێ بکات.٢٠

لەکاتژمێر ١:٣٠ خولەك بۆ ٢ی شەوی ٢٣ ی شوبات بوو کە خەڵکی یاخسەمەر و سەرگەڵوو و بەرگەڵوو لە تاریکی و باراندا  بە دەنگیناڵە و زرمەی راجیمە بەئاگا هاتنەوە......... ئەم بۆردوومانە بە هەموو نیاز و مەبەستێك، بە یەکەم تەقەی پەلاماری ئەنفال دەژمێردرێت.٢١

ئەم کیمیابارانەش بۆ چاوترساندنی هێزی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکە بوو ،ئەم هێرشە کیمیاوییە زۆر بە خەستی دەستی پێکرد و پاشان سەرلەبەیانی ٢٣ی شوبات سوپا و هێزی ئاسمانی و گاردی کۆماری و هێزە زەمینیەکانی رژێم لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ناوچەکەیاندا ، ( هێزێك لە مێرگەپانەوە بەرەو شەدەڵە ، هێزێکی تر لە دۆڵەڕووتەوە بەرەو قزلەر  ، هێزیکی تر لەقەڵەم پاشاوە بەرەو بەرگەڵو ، هێزێکی تر لەدەشتی بنگردەوە بۆ سەر گەورە قەلاّ و ئاسۆس ، هێزێکی تر لە گۆجاڕەوە      بەرەو گەورەدێ ، هێزێکی تر لە کارێزەوە بەرەو خەجەلەرزۆك)٢٢

رژێم لەم هێرشەیدا توانانەیەکی سەربازی و دارایی و ئیعلامی زۆر گەورەی بۆ تەرخان کردبوو ، لەبەر ئەوەی  وای دانا کە لەم هێرشەیدا سەرکەوتوو بێت ئەوا بە ئاسانی دەتوانێت لە قوّناغ و ناوچەکانی تردا سەرکەوتوو بێت ، سەرپەرشتیاری ئەم هێرشەی ئەنفال  لیوا روکن (سوڵتان هاشم ئەحمەد)بوو ، هێزەکانی بەشدار بوو لەم شالاّوەدا بریتیبوون لە (٢٠)لیواو ، ( ٦٠) فەوج و ، ( ١٠) فەوجی سوك و مەفرەزەی تایبەت ، جگە لە دەیان دەبابە  ئەمانە هەموویان پاڵپشتی هێزی

ئاسمانی بوون ، سەرەڕای ئەو هێزە زۆر و چەکە قورسانەش کیمیاوی بە خەستی بە کار هێنرا .٢٣

سەبارەت بە ژمارەی هێزەکانی سوپای عێراق بە نزیکەی ( ٥٠ هەزار ) کەس مەزەندە دەکرا بەڵام لە بەرامبەر ئەو هێزەدا، یەکێتی نزیکەی ٢هەزار پێشمەرگەی لە تیپی مەڵبەندەکانی ( ١ ، ٢ ، ٣ ) کۆکردبووە، بۆ پارێزگاریکردنی ناوچەکە لەگەڵ چەند مەفرەزە و هێزێکی حیزبی شیوعی عێراقی و پاسۆك و پارتی دیموکراتی کوردستان وحیزبی سوسیالیستی کوردستان.٢٤

سوپای عێراقی رۆژ بەرۆژ بەرەو پێش هەنگاوی دەناو تا سەرەتای مانگی ئازار گوندەکان یەك لەدوای یەك داگیردەکران و دانیشتوانەکەشی بەرەو ئێران هەڵدەهاتن وسوپاش بەبلدۆزەر گوندەکانی تەختی زەوی دەکرد .

رۆژانە هێرش و پەلاماری سوپای عێراق بۆ سەر هێزی پێشمەرگە زیادی دەکرد و فشاری گەورەی لەسەر سەرکردایەتی یەکێتی دروست کردبوو، بۆ سوککردنی ئەو هێرشە گەورەیەی رژێم لەسەر ناوچەکە ، هێزی پێشمەرگە هەوڵیان ئەدا بەرەی دووەم بکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو هێزە زەبەلاحەی رژێم لەسەر ئەو ناوچەیە سوك بکەن . بۆ ئەم مەبەستەش بە پاڵپشتی هێزی سەربازی ئێران شاری هەڵەبجەیان دیاری کرد کە نزیکەی ( ٨٣)کم لە سلێمانیەوە دوورە ،شوێنێکی قەرەباڵغەو نزیکەی ( ٦٠) هەزار هاوڵاتی تێدا دەژی بۆ ئەم پلانەش لە گرتنی شاری هەڵەبجەدا هێزەکانی ( پ،د،ك ـ ی، ن، ك ـ حسك ـ بزوتنەوەی ئیسلامی ) بەشدار بوون .٢٥

( لێرەدا نامانەوێت لەسەر کارەساتی هەڵەبجە هەڵوەستە بکەین چونکە لە کتێبی ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجیەکاندا بە وردی ئاماژەمان پێ کردووە .. نوسەر )

دوای نزیکەی ٢٥ رۆژ لە بەرگری و شەڕو رووبەڕووبونەوەی سەخت و بەردەوامی تۆپباران و کیمیابارانی ناوچەکە، کە بەپێی بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کە لە ١٩٨٨/٣/١٩ بڵاو کراوەتەوە، بە وردی ئاماژە بە

دەستپێکی شەڕەکە دەکات و رایدەگەیەنێت کە دەستپێکی هێرشەکە لە رۆژی ١٩٩٨/٢/٢١ دەستی پێ کردووە و ئاماژە بە قەبارەی هێزی رژێم دەکات و لەگەل خستنەرووی تەواوی زانیاریەکان لەسەر هێزەکانی سوپای عێراق، لە بەیاننامەکەدا هاتووە: ئەم شەڕە لە لایەن خودی جەلادی عێراق ( صدام حسین ) ەوە ئیدارە دەکرا، وەزیری دیفاع عەدنان خەیروڵا و ئامۆزا خوێنڕێژەکەی سەدام عەریف ( علی حسن المجید ) سەرپەرشتی دەکرا......سەرکردایەتی یەکێتی بە چاکی زانی کە خەڵکی ناوچەکە بۆ ئەوەی توشی زەرەری زۆرتر نەبن، بگوێزنەوە بۆ دەرەوەی دائیرەی جەبهەکە، لەشەوی ١٧ لەسەر ٣/١٨شدا هێزی پێشمەرگە لە هەندێك شوێنی ناوچەکە کشانەوە، تەنها ٦٠ شەهیدیدا، لەبەرامبەر ئەمەدا دوژمن زیاتر لە هەشت هەزار کەسی لە هێزە چەکدارەکانی کوژرا و بریندار هەبوو کە زیاتر لە ٤٠٠ کەسیان ئەفسەر بوون . ( بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٣ )

لە رۆژی ١٨ / ٣/ ١٩٨٨ یەکەکانی سوپا رژانە ناو سەرگەڵوو وە بەرگەڵووش هەر ئەو رۆژە گیرا و هێزە چەکدارەکانی رژێم ( القیادة العامة للقوات المسلحة) لە رۆژی ١٩ / ٣ / ١٩٨٨ دا بە بەیانی ژمارە ( ٣٠٨٧) لە هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیەوە گیرانی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی وەکو مژدەیەك بڵاو کردەوە ، هەر ئەو رۆژە بروسکەی پیرۆز بایی ( سوڵتان هاشم ) سەرکردەی هێرشەکانی ئەنفالی یەك بۆ صەدام لە دەزگاکانی راگەیاندنەوە خوێندرایەوە ، هەر ئەو رۆژە لەرۆژنامەی ( الثورة)ی ژمارە ( ٦٥٠٨)و هاوکاری ژمارە ( ٩٥٩)ەوە خوێندرایەوە . ( بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٤ ، ٥ ، ٦ )

# قۆناغی دووەمی پرۆسەی ئەنفال

## لە ٢٢ /٣ تـــا ١ / ٤ / ١٩٨٨




نەخشەی ژمارە ٣

لە دوای کۆتایی هاتنی قۆناغی یەکەمی ئەنفال رژێم خۆی بۆ قۆناغی دووەم ئامادەکرد کە قۆناغی دووەمی ئەنفال بۆ سەر ناوچەکانی ( قەرەداغ ، بازیان ، دەربەندیخان) بوو، وەکو نەریتی خۆی رژێم سەرەتای هەر قۆناغێکی ئەنفال بە هێرشی کیمیاوی دەستی پێ دەکرد، بۆیە ( ٦ )رۆژ دوای کارەساتی هەڵەبجە لە ٢٢/ ٣ / ١٩٨٨ گوندی (سێوسێنان) بەسەختی و بە شێوازی بەعسیانە درایە بەر راکێتی کیمیاوی . بۆیە ئەم چەکە بوو بە سامناکترین چەك کە دژی کورد بە کار

بهێنرێت ، ئەم هێرشە بە دەستپێکی قۆناغی دووەمی ئەنفال دا دەنرێت ، لەئەنجامی ئەم کیمیابارانەدا وێڕای زیانێکی ماددی زۆر ، بوو بە هۆی شەهید بوونی زیاد لە ( ٦٦) کەس و بریندار بوونی دەیانی تر لەناو شەهیدەکاندا (٣٠)یان منداڵ بوون .٢٦

بەهۆی هێرشی زەمینی و ئاسمانی سوپای عێراقەوە بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ، بەشێکی زۆری خەڵکی ناوچەی قەرەداغ بەرەو گەرمیان هەڵاتن لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوو ، پاش ئەوەی رژێم ئەم ناوچەیەی داگیرکردبوو سەرجەم گوندەکانی ئەم ناوچەیەی روخاند کە نزیکەی (٨٠) گوند و (٢٢٤١) خانوو کە (١٢٢٥٤) کەس لەم ناوچەیەدا دەژیان ، وە نزیکەی ( ٥٦٣٧ ) کەس بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن و شوێنبزر کران .٢٧

پاش رووخانی گشت گوندەکانی ئەم ناوچەیە ئەنفالی دوو لە ١ ی نیسانی ١٩٨٨ کۆتایی ئەم شاڵاوەش هات ، ئەم قۆناغەش بە سەرپەرشتی لیوا روکن ( ئەیاد خەلیل زەکی )بوو ، وە لەرۆژی ٢ ی نیسان سەرکەوتنی (ئەنفالی دوو) لە سەرجەم کەناڵەکانی رژێمەوە راگەیەنرا ،دەقی بەیاننامەکە بە ژمارە ( ٣١٠٩)بڵاو کرایەوە کەتێیدا باسی پاککردنەوەی تەواوی ناوچەی قەرەداغ دەکات لە ( تەکیە ، بەلەکجاڕ ، مێوڵی ، بانی مۆرد ، دەر بەند فەقەرە ، قەرەداغ ، جافەران ، پۆخشین و سێوسێنان و هەموو ناوچەکانی دەربەند باسەڕە ، سەگرمە، قۆپی قەراغ ) ٢٨ ( بروانە پاشکۆی ژمارە ٧).

## قۆناغی سێیەمی ئەنفال

## ٤/٧ تـــا ٢٠ / ٤ / ١٩٨٨




**نەخشەی ژمارە ٤**

ئەم قۆناغەی ئەنفال بە پڕزیانترین و ترسناکترین پرۆسەی ئەنفال دا دەنرێت کە زۆرترین مرۆڤی کوردی تیادا ئەنفال کرا، سنوری ئەم ناوچەیە لە رۆژئاواوە شارێی نێوان شاری پڕنەوتی کەرکوك و شارۆچکەی دوزخورماتووە، لە باکوورەوە رێگای کەرکوك – چەمچەماڵ، لە لای رۆژهەلاتەوە چیاکانی قەرەداغ و لە باشوریشەوە هەر سێ شارۆچکەی کەلار و کفری و پێبازە.٢٩

ئەم هێرشەی ئەنفال بۆ سەر ناوچەی گەرمیان بوو ، چەقی جوگرافیای ناوچەی گەرمیان ناحیەی قادر کەرەمە کە نزیکەی ( ١٠٠٠٠) هەزار کەسی تێدا دەژیا ، ئەم قۆناغە لە ٧ی نیسان بە بۆنەی جەژنی شومی دامەزراندنی حیزبی بەعسەوە دەستی پێکرد . وە ئەم هێرشە بەکاریگەرترین و کوشندەترین و بەزیانترین هەڵمەت دادەنرێت ئەمیش بۆ سەر ناوچەکانی ( چەمچەماڵ ، سەنگاو ، قادرکەرەم، دوز ، کفری ، کەلار ، بێباز ، تیلەکۆ) ، ئەم ناوچانە سەر بە هەر سێ پارێزگای (کەرکوك ، سلێمانی ، دیالا)بوون ، ئەمیش فراوانترین هێرشی ئەنفال بوو کە پتر لە ( ٥٠٠)گوندی گرتەوە سەرەڕای تەخت کردنی ٤ ناحییە. ٣٠

لە ٧ی نیسانی ١٩٨٨ هێزی زەمینی و ئاسمانی لە هەموو لایەکەوە هێرشەکانی دەست پێ کرد بۆ سەر ناوچەکانی گەرمیان و لەچەند قۆڵێکی جیاجیاوە لە ( کەرکوك و دووزو کەلار و کفری و دەربەندیخان و چەمچەماڵ )ەوە هێرشبان کردە سەر گوندەکانی گەرمیان، شاڵاوەکانی ئەنفال بۆ سەر گوند و شارۆچکەکانی گەرمیان لە سێ قۆڵەوە بوو:

١- قۆڵی دوزخورماتوو لە بەرەبەیانی ٧ی نیسان دەستی پێ کرد.

٢- قۆڵی قادرکەرەم و باکوری گەرمیان، لە ١٠ی نسیان دەستی پێ کرد .

٣- قۆڵی سەنگاو و باشووری گەرمیان، لە ٩ بۆ ١١ ی نیسان دەستی پێ کرد.٣١

هەر بۆیە سوپا ئابلۆقەی سەرجەم گوندەکانی دابوو یەك لە دوای یەك وێرانی دەکردن ، خەڵکی هەموو ناوچەکە بەرەو گوندی ( مەلەسوورە و کوڵەجۆی حاجی حەمەجان ) دەهاتن و لەوێدا کۆببونەوە ، لە رۆژی ( ١٤ / ٤/ ١٩٨٨) لوتکەی

هێرشی ئەنفال بوو ، لەم رۆژەدا بەپێی خەملاندنی ( کۆمیتەی بەرگریکردن لە مافی قوربانیانی ئەنفال ) نزیکەی ( ٢٠)هەزار لە ژن و پیاو و پیر و منداڵ کۆکرانەوە و بە ئیڤای سەربازی و تراکتۆری گوندنشیەکان رەوانەی قەڵا سەربازییەکەی (قۆرەتوو) کران و لە وێشەوە بەرەو چارەنوسی نادیار رۆیشتن، هەر بۆیە ئەم رۆژە کرا بەرۆژی (ئەنفالەکان) .٣٢

ئەم هێرشەی قۆناغی سێیەم لە رۆژی ٢٠ / ٤ / ١٩٨٨ کۆتایی هات و یەك گوند لە گەرمیاندا بە پێوە نەما و روخێنرا ، خەڵکەکەشی بە زۆری لە قادرکەرەم کۆکرانەوە و پاش تەواوبوونی ئەم قۆناغە ( عەلی حەسەن مەجید و بارق و سوڵتان هاشم ) هاتن بۆ سەیری ئەو گیراوانەی کە لە قادرکەرەم کۆکرابوونەوە . چەند رۆژێك تەلەفزیونەکانی رژێم پیشانی دەدان .

لە ئەنجامی قۆناغی سێیەمی ئەنفالدا نزیکەی (٥٠٠) گوندی گەرمیان وێران کرا کە پتر لە ( ٣٠٠٠٠)گەنج و ژن و منالّ و پیری بێسەروشوێن کرد، بەپێی خەملاندنی (کۆمیتەی بەرگری لە مافی قوربانیانی ئەنفال ) رێژەی بێسەروشوێن کردنی ئەم قۆناغە بەم جۆرە بوو :.

سنوری ناوچەی چەمچەماڵ ( ٥٦٤٥)کەسی بێسەروشوێن کراوە، قادرکەرەم (١٤٨٦٣ ) ، کەلار ( ٤٥٦٧ ) ، سەنگاو ( ٤٩٢٢ )، تیلەکۆ ( ٣٦٨٠ ) ، پێباز (٤٤٢٠) کەسی لێ ئەنفال کراوە .٣٣

( بڕوانە خشتەی ژمارە ١ )

ئاماریکی گشتی ١٠ قەزاو ناحیە کە بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون

| شار و ناحیە | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| [illegible] | ٨١ | ١٣٦٤ | ١٤٠١ | ٧٥٩٦ | ٣٦٨٠ | ٤ | ١ |
| [illegible] | ٦٩ | ١٨٤٩ | ٢٠٠٣ | ٩١٢٤ | ٤٤٢٠ | ٥ | ١ |
| قادر کەرەم | ٨٧ | ٤٠٤١ | ٦٢١١ | ٣٠٦٧٨ | ١٥٨٦٣ | ١٥ | ٤ |
| سەنگاو | ٩٢ | ١٧٧٠ | ٢٠٠٠ | ١٠١٥٩ | ٤٩٢٢ | ٢٣ | ٣ |
| کەلار | ٢٤ | ١٣٩٣ | ١٧٩٩ | ٩٤٣٠ | ٤٥٦٨ | ٧ | ١ |
| قەرەداغ | ٨٠ | ٢٢٤١ | ٢٢٧٣ | ١٢٢٨٤ | ٥٩٣٧ | ٣٠ | ٩ |
| چەمچەماڵ | ٦٥ | ١٨٩٨ | ١٩٦٠ | ١١٦٥٣ | ٥٦٤٥ | ١٥ | ٢ |
| ئاغجەلەر | ٩٧ | ٢٨١٣ | ٢٧٦٠ | ١٥٨٦٤ | ٧٦٠٩ | ١٠ | ١ |
| بازیان | ٥٣ | ١٥٨٢ | ١٥٤٢ | ٧٦١٦ | ٣٦٨٩ | ٢٠ | ٤ |
| [illegible] | ٤٧ | ٢١٤١ | ٢١٩٥ | ١٠٦٣٣ | ٥١٤٦ | ١٥ | ٧ |
| کۆی گشتی | ٦٧٧ | ٢١١٤٢ | ٢٣٧٩٩ | ١٢٣٩٩٧ | ٦٠٠٧٦ | ١٤٤ | ٣٣ |

[illegible]

زیانەکانی ئەنفالی گەرمیان لە ماوەی نێوان ١٩٨٧ – ١٩٨٨ بەم شێوەیە بووە.

١- ٧٨١ گوند سوتێنران و لەگەڵ خاکدا یەکسان کران.

٢- شەش مەرکەز و ناحیە وێران کران

٣- ٣٩١٧٨ خانوبەرە وێران کران

٤- ٣٨١ قوتابخانە و ٦٥٧ مزگەوت و ٦٩ نەخۆشخانە وێران کران

٥- ٤٥٧٧٧ خێزان ئاوارە و بێسەروشوێن کران

٦- ٥٢ عەماراوی ماتۆری ئاو ٤٧ مەکینەی ئاش و ١٣٥ کارێز و ئەستێل تەقێنرانەوە

٧- ١٥٧ تەکیە و خانەقا و مەرقەد و شوێنەواری ئایینی وێران کران

٨- ١٤٣٥ رەز و باخ سوتێنران

٩- ١٧٢٢٠ تراکتۆر و مەکینەی جۆراوجۆر سوتێنران و تاڵان کران

١٠- ٤٧٢٧٧٠ سەر مەر و بزن تاڵان کران و فەوتێنران و ١٥٠٠٠ رەشەوڵاخ تاڵان کران و فەوتێنران

١١- ٥٧٠٠٠ تەن گەنم و جۆ و دانەوێڵە فەوتا و سوتێنران

١٢- بێسەروشوێن کردنی زیاتر لە ( ٨٠٠٠٠ ) هاوڵاتی کورد لە ژن و منداڵ و پیر و گەنج . ٣٤

## قۆناغی چوارەمی ئەنفال

## لە ٣ / ٥ تـــا ١٥ / ٥ / ١٩٨٨




**نەخشەی ژمارە ٥**

ئەنفالی چوار لە ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٣ بە کیمیاوی بارانکردنی خەستی گوندی گۆپتەپە و عەسکەری سەر بە ناحیەی ئاغجەلەر دەستی پێ کرد، ئەو بومبارانە کیمیاویە بوە هۆی کوشتنی ١٥٤ کەس و برینداربوونی سەدان کەسی دیکە. ٣٥

له کاتژمێر (٥:٤٠)دەقیقەی دەمەوئێوارە ( ١٣ی رەمەزان ) کاتژمێرێك پێش رۆژوشکاندن شەش فڕۆکەی جۆری مێك لە رۆژی ٣ / ٥ / ١٩٨٨ هەڵیانکوتایە سەر گوندی گۆپتەپە و کیمیابارانیان کرد و پاشان گوندی عەسکەریشیان کیمیاباران کرد . ئەم قۆناغەش بۆ سەر ناوچەکانی ( ئاغجەلەر ، ناوشوان ، چەمی رێزان ، دەشتی کۆیە ، تەق تەق ) لە سنووری هەر سێ پارێزگای ( هەولێر ، سلێمانی ، کەرکوك ) بوو .

سەرلەبەیانی رۆژی ٤ی مایس هێزی پیادەی رژێم لە هەموو لایەکەوە دەستی پێ کرد ئەم هێرشە بە فەرماندەی لیوا روکن (سوڵتان هاشم) بوو بەشێك لەم هێرشە لەچەمچەماڵ وتەکیەوە بەرەو ناحییەی ئاغجەلەر کەوتە رێ ئەم ناحێیە سالێك لەوەوپێش روخابوو پاشان هێرشێکی تر لە سوسێوە بەرەو سوورقاوشان کەوتەڕێ و هێرشێکی دیکە لە ناوچەی تەقتەقەوە بۆ گوندەکانی لێواری زێی بچوك و شێخ بزێنی و گۆپتەپە، هێرشێکی دیکە بەرەو گوندەکانی نزیك قەزای کۆیە بەڕێ کەوت . هەندێ لە خەڵکی ئەم ناوچانە بەرەو جادەی چەمچەماڵ سلێمانی و هەندێکیان بۆ باینجان و تەکیە بەڕێ کەوتن ، وە بەشێکی زۆری خەڵکی ناوچەکە بەرەو تەقتەق بەڕێ کەوتن لەوێ دەستگیر کران ، هەر وەك لە راپۆرتی دەستنووسی رۆژانەی ژمارە ( ٨٢٨٠) لە ٦ / ٥ / ١٩٨٨ لە فەرماندەی فەیلەقی یەکەوە بۆ بارەگای عەمەلیاتی سوپا تا ئەو رۆژە لە نزیك شارۆچکەی تەقتەق ئەوانەی خۆیان بەدەستەوە داوە ( ٦٠) پیاو و (١٢٩)ژن و ( ٣٩٦)منداڵ بوون، لەگەڵ ٣٧ پێشمەرگە .٣٦
سوپا لە رۆژی ٥/١٥/ سەرجەم گوندەکانی ئەم ناوچەیەی روخاند و تەنها لە ناوچەی ئاغجەلەر کە ( ٦٧) گوندی تیدا بوو (٢٨١٣)خانوی تێدا بوو ( ١٤٨٦٤)کەسی تێدا دەژیا نزیکەی ( ٧٢٠١) کەس ئەنفال کراوە .٣٧

## قۆناغی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمی ئەنفال
## لە ١٥ / ٥ تـــا ٢٦ / ٨ / ١٩٨٨




نەخشەی ژمارە ٦

لە دوای تەواوبوونی چوار قۆناغی ئەنفال کە سوپای عێراق توانی زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە وێران بکات و داگیر بکات، هەر بۆیە جێبەجێکردنی قۆناغەکانی دیکەی ئەنفال بۆ سوپای عێراق ئاسانتر بوو، قۆناغەکانی ( پێنجەم و شەشەم و حەوتەم)ی ئەنفال، بۆ سەر دۆڵی نێو چیاکانی (شەقلاوە و ڕەواندوز ) بوو وە لەڕۆژی ١٥ی مایس دەستی پێ کرد ، ئەم پەلامارەش بە سەرپەرشتی فەرماندەی فەیلەقی ( ٥)و سەرپەرشتیاری ئەم

قۆناغەی ئەنفال ( یونس محمد زەرب بوو) ، سەرەتای ئەم پەلامارەش هەروەکو سەرجەم پەلاکارەکانی دی رژێم بە هێرشی کیمیاوی دەستی پێ کرد ، رۆژی ١٥ / ٥ / ١٩٨٨ دوا رۆژی رەمەزان بوو خەڵکی خۆیان بۆ جەژنی رەمەزان ئامادە کردبوو چەند فرۆکەیەك کەوتنە کیمیابارانکردنی گوندەکانی ( وەرە ، عەلی یلوا ، سماقولی ، نازەنین ) لەم پەلامارەدا لە گوندی وەرە ( ٣٦)کەس شەهید بوون (١٧)پیاو و (١٩)ئافرەت .٣٨

لە میانی بەرێوەچوونی ئەم قۆناغەی ئەنفالدا، حکومەتی ئێران رەزامەندی بۆ رێکەوتننامەی راگرتنی جەنگ دەربڕی، بۆیە لە دوای قۆناغی پێنجەم و قۆناغەکانی شەشەم و حەوتەم دواکەوت ئەویش بە هۆی ئەوەی کە لە ١٧ی تەموزی ١٩٨٨ ( عەلی خامنەئی) سەرۆك کۆماری ئێران ( خافێر پێرێس دیکویلاری) سکرتێری گشتی ئەوکاتی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئاگادار کردەوە کە ولآتەکەی بە نیازە بڕیاری (٥٩٨)*ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان قبولّ بکات . ٣٩

رژێم توانی لە رۆژی ٢٦ / ٨ سەرجەم گوندەکانی ئەم دەڤەرەش داگیر و وێران بکات و خەڵکێکی زۆری ئەم ناوچەیە دەستگیر کران، لە میانەی شاڵاوەکانی ئەنفالی ( پێنج و شەش و حەوت )دا زیاتر لە ( ٥٢) گوند لە ناحیێکانی خەلیفان و خۆشناو و رەواندوز وێران کران کە سەرجەم (٢٦٠٢) خێزان بوون وە ( ٥٢) مزگەوت و (٢٤) قوتابخانەی ئەم گوندانە وێران کران ، ئەمە جگە لە کوێرکردنەوەی سەدان کانی و جۆگە و سوتاندنی سەدان رەز و باخی ناوچەکە کە ئەمانە ژێرخانی ئابووری ئەم ناوچانەی پێك دەهێنا .٤٠

* بڕیاری ژمارە ( ٥٩٨)ی ئەنجومەنی ئاسایش کە لە ٢٠ / ٦ / ١٩٨٧ دەرکرا و داوای دەستبەجێ راگرتنی شەڕی نێوان عێراق و ئێرانی کرد لەژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا .

## قۆناغی هەشتەم و کۆتایی ئەنفال

## ٢٦ / ٨ تــا ٦ / ٩ / ١٩٨٨




**نەخشەی ژمارە ٧**

لە دوای وەستانی شەری نێوان عێراق و ئێران لە ١٩٨٨/٨/٨ سوپای عێراق تەواوی هێزەکانی لە ناوچە سنوورییەکان کشاندەوە بۆ بەرەکانی ئەنفال ، کە لەو کاتەدا ٧ قۆناغی ئەنفال کۆتایی هاتبوو تەنها قۆناغی هەشتەمی ئەنفال مابوو، قۆناغی هەشتەمی شالأوی ئەنفال بۆ سەر دەڤەری بادینانی سنووری تورکیا بوو ، سنووری پەلاماری قۆناغی هەشتی ئەنفال بریتی بوو لە : دهۆك، زاخۆ ، باتوفە، کانی ماسیٚ، زێوە، دێرەلوك، ئەتروش و زاوێتە. ٤١

لەم هێرشەدا سوپای عێراقی ورەی زۆر بەرز بوو هەر وەك لیوا روکن ( یونس محمد زەرب) فەرماندەی فەیلەقی ( ٥)و سەرپەرشتیاری ئەم قۆناغەی ئەنفال دەنوسێت ( ورە زۆر بەرز بوو هەر لە سەرەتاوە بە روخساری سەربازەکانەوە دیار بوو ، بە

تایبەتی لە دوای داتەپینی ئێرانی دوژمن و تێکشکاندنی لەو هێرشە سەرکەوتوانەدا کە بە شەڕی قارەمانانەی (فاو) دەستی پێ کرد و تا شەڕی (محمد رسول الله)ی خایاند ) .٤٢

سەرەتای هێرشەکەش بۆ چاوترساندنی خەڵکەکە بە کیمیابارانکردن دەستی پێکرد، پاش کیمیابارانێکی خەست رژێم هێرشی زەمینی لە رۆژی ٢٨ / ٨ / ١٩٨٨ دەست پێ کرد ، ئەم شاڵاوە لە رۆژئاواوە لە زاخۆوە تا ئامێدی درێژ بووەوە لە باشوور و رۆژهەلأتیشەوە شێخان و ئاکرێی گرتەوە .

هێزەکانی دوژمن لە ئەنفالی هەشتدا پێك هاتبوو لە سیو هەشت لیوای پیادە و دوو لیوای زرێپۆش و سێ کەتیبەی تۆپ و سەد و حەفتا و یەك فەوجی جاش، هێزی کورد لە ئەنفالی هەشتدا بریتی بوون لە پێشمەرگەکانی لقی یەکی پارتی دیموکراتی کوردستان و هێزەکانی مەڵبەندی چواری یەکێتی لە بادینان و هێزی حیزبی شیوعی و پارتی گەل و حیزب و الله ی کورد و بزووتنەوەی ئیسلامی.٤٣

پاش روخانی سەرجەم گوندەکانی ئەم ناوچەیە لە رۆژی ٦ / ٩ خاتمەی ئەنفال راگەیەنرا و هەر بەو بۆنەیەشەوە لێبوردنی گشتی راگەیەنرا بۆ ئەوانەی کە دەرباز بوون بە پێی خۆیان بگەڕێنەوە ، ئەو خەڵکەی کە سوپا دەستگیری کردبوون بەم جۆرە تۆمار کرابوو :. ئەو تێکدەرانەی خۆیان بەدەستەوە داوە ( ٨٠٣) پێشمەرگەبوون ، ئەو تێکدەرانەی کەوا گیراون ( ٧٧١ )کەس بوون ، پیاوی مەدەنی ( ١٤٨٩)کەس ، ژن ( ٣٣٦٨) ، منداڵ ( ٦٩٦٤) ، سەرجەمیش ( ١٣٣٩٥ )کەس بوون . ٤٤

هەروەك (منظمة العفو الدولية) لە ١٤ / ٦ / ١٩٩٠ دا سەبارەت بە ئاوارەبوونی خەڵکی گوند نشینەکانی ناوچەی بادینان دەنوسێت: ( لە مانگی ٨ـ٩ی ١٩٨٨ زیاد لە (٥٥٠٠٠) کوردی عێراقی لە باکووری عێراق بەرەو تورکیا هەڵهاتن لە ترسی هێرشی سوپای هێزەکانی حکومەتی عێراقی دژی ئامانجە مەدەنییەکان بە کاری دەهێنا هەروەك بە کار هێنانی چەکی کیمیاوی ) . **( بروانە پاشکۆی ژمارە ٨ )**

# کاریگەریەکانی ئەنفال

لە دوای کۆتایی هاتنی سەرجەم قۆناغەکانی ئەنفال و وێران کردنی تەواوی خاکی کوردستان، لەم پرۆسەیەدا بە هەزاران مرۆڤی کوردی تیادا لەناوبراو هەزارانیش دەستگیر کران، ئەم پرۆسەیە لە مانگی شوباتەوە تا سەرەتای مانگی ئەیلولی خایاند و گەورەترین زیانی گیانی بە گەلی کورد گەیاند ، هەروەك ( میدلْ ئیست ووچ) دەنوسێت ( پرۆسەی ئەنفال لە ٢٣ ی شوبات تا ٦ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٨ ی خایاند لەو ماوەیەدا فراوانترین ناوچەی کوردستان بەر شاڵاوی تێکدان و راپێچان کەوت ، لە هەڵمەتێکی وادا پتر لە (٢٠٠)هەزار مرۆڤی کورد لەناو بران ، وە لای کوردو بزوتنەوەی سیاسی کوردیش (١٨٢) هەزار کەس رۆیوە ، لەناوبردنی ئەو خەڵکە زۆرەش کێشەوگرفتێکی لەچارەنەهاتووی بۆ پاشماوەکەی خۆی و گەلی کورد بەجێ هێشت ).٤٥

بەڵام سەبارەت بە ژمارەی راستەقینەی ئەنفالکراوان، تا ئێستا هیچ ئامارو داتایەکی راستەقینەی ئەنفالکراون لەبەردەستدا نیە و ئەوەی تا ئەمڕۆش دەوترێت خۆی لە چەند داتاو ئامارێکی جیاوازدا دەبینێتەوە لەوانە:.

١- سەرکردایەتی سیاسی کورد باسی لەناوبردنی ( ١٨٢ هەزار ) مرۆڤی کورد دەکات، کە ئەم ژمارەیە تەنها ژمارەیەکی سیاسیە و یەکەم جار لە ١٩٩١/٩/١١، جەلال تالەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، لە وتارێکدا لە سلێمانی بە کاری هێنا، کە لەو کاتەدا هیچ ئامارێك لە لایەن دامودەزگایەکی رەسمی لە ئارادا نەبوو.

٢- بەپێی وتەی بەرپرسانی رژێمی بەعس ژمارەی ئەنفالکراوان ( ١٠٠ هەزار ) کەس بووە، لە کاتی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی و

بەرپرسانی رژێمی بەعس لە مایسی ١٩٩١ کاتێ وەفدی کوردی داوای ئاشکراکردنی بێسەروشوێنینانی ئەنفال دەکات و رایدەگەیەنێت کە ١٨٢ هەزار کەس بووە، عەلی حەسەن مەجید هەڵچووە و تەقیوەتەوەو وتویەتی تێکرای ئەوانەی لە ئەنفالدا کوژراون ( بەهیچ جۆرێك لەسەد هەزار تێنەپەڕیوە ) . ٤٦

٣- بە پێی خەمڵاندنی میدل ئیست ووچ و رێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان لە ئەنفالدا لانی کەم ( ٥٠ بۆ ١٠٠ هەزار ) کەس کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوونە لە نێوان شوبات و ئەیلولی ١٩٨٨ دا کوژراون. ٤٧

٤- هاوکات بە پێی ئاماری وەزارەتی ماف مرۆڤی ئیدارەی سلێمانی کە لە ٢٠٠٢ -٢٠٠٣ لە سنووری ئیدارەی سلێمانی هەستا بە ئاماری ئەنفالکراوان، بەڵام تا ئێستا ئامارەکە رانەگەیەنراوە، بەپێی سەرچاوەکان لەبەر کەمی ژمارەکە رانەگەیەنراوە، کە نزیکەی ( ٢٥ هەزار ) کەس بووە، ئەمە لەکاتێکدایە زۆربەی ئەنفالکراون بە نزیکەی ( ٧٠٪ بۆ ٨٠٪ ) ئەنفالکراوان لە سنووری ئیدارەی سلێمانیدا بوون، خۆ ئەگەر سنووری هەولێر و دهۆك و ناوچە جێناکۆکەکانیشی بچێتەسەر ناگاتە ( ٤٠ هەزار ) کەس.

لەگەڵ ئەوەی دەبوو تا ئێستا نەك تەنها مرۆڤەکان بەڵکو ئاماری تەواوی رەز و باخ و ئاژەڵ و دارودرەخت و باڵندەی پرۆسەی ئەنفال لەبەر دەستدا بوایە چونکە لە دونیای ئەمرۆدا ئامار و داتای دروست پاڵپشتی گرنگن بۆ سەلماندنی کەیسەکان.

بڕوانە وێنەی ژمارە ١



پرۆسەی ئەنفال بووە هۆی وێران کردنی نزیکەی (٤)هەزار گوند و ، (٤)قەزا ، ( ٣٠)ناحییە و ، ( ٣١٠٠)مزگەوت و (١٠٠)کڵێسا ، وە لە رووی گیانداریەوە بووە هۆی بەتاڵانبردنی (٢)ملیۆن سەر مەڕ و ماڵات و ئاژەڵ ، ئەنفال جگە لەو زیانانەی سەرەوە کارەساتێکی ژینگەیی ئایکۆلۆژی گەورە بوو کەبووە هۆی شێواندنی رواڵەتی گیانداری و رووەکی ناوچەکە و بووە هۆی لەناوبردنی رووبەرێکی فراوان لە باخ و رەز و چەم و چنار کە هاوسەنگی ژینگە لاسەنگ دەکات. ٤٨

هەروەك ( د. کەندال نزان ) دەربارەی شاڵاوەکانی ئەنفال دەنوسێت ( لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا بنەماکانی ژیان لەکوردستان هەڵتەکێنران ، دوای ئەوەی ئەو هستریا شێتانەی جینۆسایدی کورد کۆتایی هات لە ( ٩٠٪ ) ی گوندەکانی کوردستان و زیاتر لە ( ٢٠ ) شار و شارۆچکە لەسەر نەخشە سڕانەوە ، ناوچە گوندنشینەکان بە ( ١٥ ) ملیون مین مینرێژکران ، بەم جۆرەش چالاکی کشتوکاڵی لەو ناوچانەدا کارێکی ئەستەم بوو ( ١,٥ ) ملیۆن کوردی گوندنشین بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان گوێزرانەوە ، نزیکەی ( ١٠٪ ) ی کوردی دانیشتوانی عێراق لەنێوبران).٤٩

## گرتن و زیندانیکردن و لەناوبردن

لە دوای کۆتایی هاتنی تەواوی قۆناغەکانی ئەنفال دەستگیرکردن و کۆکردنەوەی هاولاتیان، سەرەتا لە شوێنی دەستگیرکردنیان لە سەنتەری ناحێکان کۆدەکرانەوە، دواتر دەبران بۆ کەمپی سەربازیی تایبەت، زۆربەی گیراوانی سنوری گەرمیان گوێزرانەوە بۆ ( تۆپزاوا ) کە بریتیە لە سەربازگەیەکی گاردی میللی لە نزیك کەرکوك لەسەر رێگای (تکریت) ئەم بەندیخانەیە نزیکەی ( ٣٥)قاوش دەبوو هەر یەکەیان نزیکەی ( ٢٠٠) کەسیان تێدەکرد ، ئەمیش زۆر قەرەباڵغ بوو ، خەڵکەکە هەموو بە چیچکانەوە دادەنیشتن ، رۆژانە هەر یەکەیان دوو سەمونی رەقیان دەدانێ . ٥٠

سەبارەت بە گیراوانی بادینانیش، دوو شوێنی سەرەکی تەرخان کرابوو، یەکێکیان قەڵا سەربازیەکەی نزارکێی دهۆك و ئەوی تریش بەندیخانەی سەلامیەی موسڵ بوو کە بەپێی راپۆرتی فەرماندەی فەیلەقی پێنج ( ١٣ هەزار و ٣٩٥ ) کەس لە ئەنفالی بادینان گیران.٥١

لە دوای کۆکردنەوەی ئەنفالکراوان  لە کەمپەکاندا، دەستکرا بە لێکجیاکردنەوەیان، بەپێی تەمەن و رەگەز، لەوێدا پۆلێن کران بەم شێوەیە:.

١- لە تەمەنی  ١٢ ساڵ تا ٤٥ ساڵ .

٢- تەمەنی  ٥٠ ساڵ و سەروتر .

٣- ژن و منداڵ .

٥-     کچ  بە جیا .٥٢

بڕوانە وێنەی ژمارە ٢



دوای جیاکردنەوە و پۆلێنکردنیان کەوتنە پلاندانان بۆ دوورخستنەوە و بێسەروشوێن کردنی ئەو خەڵکە بێشومارە ، هەروەك (عەلی حەسەن مەجید) لە کۆبونەوەیەکیدا دەڵێت : ( ئایا دەکرا هەروا بە ڕێکوپێکی دایان نێم ، ئێ من ئەم خەڵکە بێشومارە لە کوێ دابنێم ..؟ .. چی لەم بزنانە بکەم ..؟ خزمەتیان بکەم ؟ نەخێر .... بۆیە کەوتمە دابەشکردنیان بەسەر پارێزگاکاندا و ئەوکاتەش بە بلدۆزەر دەیانکەمە ژێر خۆڵەوە).٥٣

لە دوای چەند ڕۆژێکی کەم مانەوەیان لەو کەمپانە دەستکرا بە گواستنەوەیان بەسەر سێ بەشدا:.

یەکەم/ ئەو بەشەی کەتەمەنیان لە نێوان ( ١٢ ـ ٤٥)ساڵ بوو واتا گەنجەکان بەشی زۆریان بە دەست و چاوی بەستراوەوە سواری پاسی داخراو کران و بەرەو باشوور بەڕێ کران و پاشان بێسەروشوێن کران، بەپێی گێڕانەوەی ئەو کەسانەی کە لە مەرگەساتەکە ڕزگاریان بووە، لە بیابانەکانی ڕومادی و عەرعەردا زیندەبەچاڵ کران.

دووەم/ ئەو بەشەی کە ژن و منداڵ بوون بۆ سەربازگەی ( دبس) گوێزرانەوە لە نزیك تکریت ، ئەمانیش هەموو بە پاسی داخراو گوێزرانەوە ، وە ئەم بەندیخانەیە نزیکەی (٧)هەزار بەندی تێ خزێنرابوو ، دواتر بەشێکیان بێسەروشوێن کران و بەشێکیشیان ئازاد کران.

سێیەم/ ئەو بەشەش کە تەمەنیان لە نێوان ( ٥٠ - ٩٠)ساڵیدا بوو واتە پیرەپەککەوتەکان بەرەو قەلاّی بەجێماوی ( نوگرەسەلمان )لە باشووری عێراق نێردران ، پاش ئەوەی ئەم پیرانەیان بە ئۆتۆمبێل گوێزایەوە بۆ نوگرە سەلمان کە نزیکەی ( ١٥)کاتژمێر لە تۆپزاواوە دوورە ، لەم بەندیخانە چۆڵەدا نزیکەی (٨)هەزار بەندی تێدابوو ،کە لەژیانی دۆزەخی ئەم پیرەپەککەوتانە پاش لێبوردنەکەی ٦ / ئەیلولی / ١٩٨٨ ئازاد کران.٥٤

## تەوەرەی دووەم/ لە نێوان دەرسیم و ئەنفالدا

یەکەم/ هۆکاری سەرهەڵدانی شۆڕشی دەرسیم

دووەم/ پلاندانان بۆ کۆمەڵکوژی دەرسیم

سێیەم/ ژمارەی کۆمەڵکوژیەکەی دەرسیم

چوارەم/ چیرۆکەکانی مەرگ لە دەرسیم و ئەنفال

پێنجەم/ ژن لە کۆمەڵکوژی دەرسیم و ئەنفالدا

## تەوەرەی دووەم/ لە نێوان دەرسیم و ئەنفالدا

لەگەڵ ئەوەی لە مێژووی کورددا، دەیان رووداو و کارەسات و کۆمەڵکوژی گەورە هەبووە، کە لە زۆر رووەوە هاوشێوەی جینۆسایدی ئەنفالە، بەڵام لێرەدا بەراوردێکی ورد دەکەین لە نێوان پرۆسەی ئەنفال و کۆمەڵکوژی دەرسیمدا، بەو پێیەی کۆمەڵکوژی دەرسیم سەرەرای ئەوەی پرۆسەیەکی دەوڵەتی تورکیا بوو بۆ پاکتاوکردنی کوردانی باکووری کوردستان، لە هەمان کاتدا شێوازی کۆمەڵکوژیەکان و وێرانکردنی گوندە کوردیەکان و گوللە بارانکردنی گەنجان و پیاوان و ژن و منداڵەکان، لە جێگەیەکدا دوای کۆکردنەوەیان، تەواو هاوشێوەی پرۆسەی ئەنفالە، ئەمە سەرەڕای دەستدرێژی کردنەسەر ژنان و کچان و حەڵاڵکردنی ژنانی کورد، کە خاڵی جەوهەری ئەم لێکۆڵینەوەیەیە لە هەردوو پرۆسەکەدا.

رەنگە لە مێژوودا دەیان رووداو و کۆمەڵکوژی تر هەبووبێت تیایدا هاوڵاتیان بە کۆمەڵ کوژرابن و دەستدرێژیش کرابێتە سەر ژنان و کچان تیایدا، بەڵام هیچ رووداوێك لە مێژوودا هێندەی کۆمەڵکوژی دێرسیم، نزیك نیە لە پرۆسەی ئەنفالەوە:

١- کۆمەڵکوژی دەرسیم پلان و بەرنامەی حکومەتی تورکیا و مستەفا کەمال بوو بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کورد، پرۆسەی ئەنفالیش هەوڵێك

بوو بۆ سڕینەوەی نەتەوەی کورد و گشت شوێنەوارێکی کلتوری و ژینگەیی و ئاو و هەوای کوردستان.

٢- کۆمەڵکوژی دەرسیم هەوڵێك بوو بۆ سەرکوتکردن و لەناوبردنی شۆڕشی کورد و بەتایبەتیش شۆڕشی سەید ڕەزای دەرسیم، ئەنفالیش هەوڵێك بوو بۆ سەرکوتکردنی شۆڕش و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان.

٣- دەرسیم بە بەرنامە و پلانی ورد ئەنجامدرا و حکومەتی تورکیا پێشتر پلانی بۆ دارِشت و دواتر جێبەجێی کرد، ئەنفالیش بە پلان و بەرنامەی ورد و ساڵێك پێشتر نەخشەی بۆ دارێژرا.

٤- لە کۆمەڵکوژی دەرسیمدا جیاوازی نەدەکرا لە نێوان پیاو و ژن و پیر و گەنج و منداڵدا، هەموویان پێکەوە لەناودەبران، لە ئەنفالیشدا بەبێ جیاوازی ژن و پیر و گەنج و منداڵ، هەموو پێکەوە زیندەبەچاڵ کران.

٥- لە دەرسیمدا بە ئاشکرا دەستدرێژی دەکرایەسەر ژنان و کچان ، لە ئەنفالیشدا ئەو ڕەفتارە هەبووە.

٦- بەشێك لە هاولاتیان لە کۆمەڵکوژیەکاندا بە ئەستەم ڕزگاریان بووە و حیکایەتە جەرگبڕەکان دەگێڕنەوە، لە ئەنفالیشدا چەند کەسێکی کەم لە گۆرە بە کۆمەڵەکان ڕزگاریان بووە و حیکایەتی مەرگ دەگێڕنەوە.

## یەکەم/ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شۆڕشی دەرسیم

شۆڕش و سەرهەڵدانی کوردانی باکووری کوردستان لە دەرسیم، چەندین هۆکار و فاکتەری لە خۆ گرتبوو، کە ڕەنگە لە گرنگترینیان پەیوەندی بە نکۆڵی دەوڵەتی تورکیای کەمالیەوە هەبووبێت لە نکۆڵی کردن لە بوونی کورد لە تورکیا و ئەژمارکردنیان بە تورکی شاخاوی.

شۆڕشی دێرسم یەکەمین شۆڕش نەبوو لە دوای رووخانی دەوڵەتی عوسمانییەوە، بە پێچەوانەوە چەندین شۆڕشی دیکە بەرپاکرابوون وەکو راپەڕینی کۆچگیری Koçkiri (١٩١٩– ١٩٢١) و شۆڕشی شێخ سەعید ١٩٢٥ لە شۆڕشە گەورەکان بوون. هەروەها چەندین ڕاپەرینی بچکۆلەی دیکە کران کە تەنها گرنگییەکی هەرێمییان هەبوو لە ڕۆژهەڵاتی ئەناتۆلیا لە باکوورەوە لە چیایی ئاراراتەوە بیگرە هەتا دەگاتە نسێبین لە باشوور. خەڵکی دێرسیم لە زۆرێك لەو راپەڕینانەدا بەشدارییان کردووە و هەندێك جاریش دەوری سەرەکییان بینیووە. هەروەها باسی ئەوە دەکرێت کە لەشکری تورکیا لە ساڵی ١٨٧٦ وە، زیاتر لە ١١ جار هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی دێرسیم تاوەکو سزای خەڵکی ئەو ناوچەیە بدات. لە ساڵانی ١٩٣٠ دا، دیرسیم تاکە ناوچە بوو کە بە تەواوەتی لە دەرەوەی کۆنترۆڵی دەوڵەتی ناوەندیدا بوو. ئەو ناوچەیەش خۆی لە خۆیدا ناوەندێك بوو لە بنیاتی دەوڵەتی نوێی تورکیادا کە سنوورەکانی لە باکوورەوە بە ئەرزنجان، لە باشووریشەوە بە ئلازیگ (خارپوت)ەوە بوو. هەروەها لە هەموو ناوچە کوردییەکانی دیکەوە نزیکتر بوو لە ئانقەرەوە و دەیتوانی ببێتە هۆی بچڕانی پەیوەندییە گەورەکان. جوگرافیاکەی، شاخی سەربەفراوی بەرز و دۆڵی باریکی تێدا هەڵکەوتووە کە ئەویش بەردەوامییەك (یارمەتیدەرێك بوو) بۆ سەربەخۆییەکەی. لەبەر ئەوەی رێگاوبانی زۆر نەبوو و خراپ بوون دەتوانرا بە ئاسانی خۆیان لە داگیرکەران بپارێزن. ٥٥

دیارە شۆڕشی دەرسیم درێژکراوەی شۆڕش و نارەزایی و راپەڕینەکانی پێشتر بوو دژ بە دەوڵەتی تورکیا کە هەوڵی لەناوبردنی نەتەوەی کوردی دەدا، لە دوای

دامرکانەوەی بێبەزەییانەی ١٩٢٥ بە سەرۆکایەتی شێخی پیران و ئاگری داغ و رابەرایەتی خۆیبوون و ئیحسان نوری پاشا لە ١٩٣٠ – ١٩٣٢، کاربەدەستانی تورکیا بریاریاندا تۆڵەی سەدان ساڵەی خۆیان لە دێرسیم و دانیشتوانەکەی بکەنەوە، راپەڕینی دێرسیم بە زازایی ( تەرتەلەی دێرسیم ) کاردانەوەیەك بوو بۆ سیاسەتەکانی حکومەتی مستەفا کەمال، تا ساڵی ١٩٣٥ هێشتا دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی بەسەر ئەو ناوچەیەدا نەدەرۆیشت. ٥٦

سەرەرای چەوساندنەوەی نەتەوەویی و سەرکوتکردنی شۆرش و راپەڕینەکانی باکووری کوردستان، دەوڵەتی تورکیا باج و سەرەانی زۆری خستبووە سەرکوردەکان و بەتەواویش لە رووی خزمەتگوزاریەوە پشتگوێی خستبوون، حکومەت بریارێکی تازە و تایبەتی دەرکرد بۆ سەندنی باج لەسەر دانیشتوانی دەرسیم و ئەم بریارەی حکومەت بووە هۆی پشێوی و شۆڕشێکی تازە لە ساڵی ١٩٣٧لە ناوچەکەدا دەستی پێ کرد، ئەم بڕیارەی حکومەت و بڕیارێکی تری کە بریتی بوو لە داگیرکردنی زەویوزاری کورد و دابەشکردنی بەسەر ئەو تورکانەدا کە هێنابویانە ناوچەکە ئەوەندەی تر هەلوێستی ئالۆز کرد..... ئەمە سەرەڕای هەڕەشەکردن و ترساندن و سزادان و کوشتوبڕی خەڵك لەسەرجادەکان و وە بۆ ترساندنی خەڵك چەند کەسێکی لە سێدارەدا لەوانەی دژی حکومەت وەستا بوون لە نەدانی باج. ٥٧

دیارە لەو سەردەمەدا دەرسیم، کە دانیشتوانی لە خێڵی بچوك بچوك کە یاسا و رێسای تایبەتی و دابونەریتی تایبەت بەخۆیان هەبوو. هیچ سەرژمێریەکی تەواو لەناوچەکەدا نەکرابوو چونکە خەڵکی ئەو ناوچەیە باج و سەرانەیان نەدەدایە دەوڵەت و هیچ دامودەستگای دەوڵەتی تورکی لە ناوچەکدا نەبوون. بەڵام دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی کە دەوڵەتی تورك هێرشی کردەسەر، بە ٦٥ تا ٧٠ هەزار کەس مەزەندە دەکرێت. رەنگە ١٥٠ هەزار کەس لە ناوچەکانی دەرەوەی هێرشە سەربازییەکان ژیابن. ٥٨

## دووەم/ پلاندانان بۆ کۆمەڵکوژی دەرسیم

لە ساڵی ١٩٣٦ هێزە سەربازیەکانی تورکیا بە سەرۆکایەتی ( جەنەراڵ ئالپ دۆغان) بە فڕۆکە بۆردوومانی ناوچەکەیان کرد و دواتر بە تانك و سوپاوە پەلاماری دێرسیمیاندا، پاش ئەوە پەیامی ئاشتیخوازانەی سەید رەزا کوردی عەلەوی لەلایەن جەنەراڵی تورکەوە گوێی لێناگیرێت، هۆزەکانی زازا هاتنە ژێر فەرمانی سەید رەزاوە دژی سوپای تورك کەوتنە جەنگ، ٥٩

بەڵام هەر کە نوێنەرانی حکومەت کە پێکهاتبوون لە پۆلیس و کارمەندانی باجوەرگر لە ناوچەکدا خۆیان نیشاندا، کوردەکانی دیرپسم لە ساڵی ١٩٣٧ دەستیان بە راپەڕین کرد، سوپای تورکیا بە ناردنی ٢٥ هەزار سەرباز لە هاوینی ١٩٣٧ وەڵامی دانەوە، ساڵێك دوای ئەوە واتە ساڵی ١٩٣٨، ژمارەی سەربازەکانی گەیاندە ٥٠ هەزار. بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەی دانیشتوانی ناوەندی دێرسیم کە خۆی لە ٦٥ تا ٧٠ هەزار کەس دەدا، هێزی تورکیا زۆر زۆر گەورەبوو، ئامانجیش لەوە ئەوە بوو کە بۆ هەتا هەتایە لە رەگوڕیشەوە دەریانبهێنن.٦٠

هەر بۆیە حکومەتی تورکیا پلان دادەڕێژێت بۆ سەرکوتکردنی شۆرشگێران و وێرانکردنی ماڵ و حاڵیان، لە ٤ی مایسی ١٩٣٧دا، حکومەتی تورکیا لە کۆبوونەوەیەکدا مستەفا کەمال تیایدا بەشداربووە، لە کۆبوونەوەکەدا ( فەوزی چەقماق ) سەرۆکی ئەرکانی سوپا ئامادە دەبێت، بڕیاری ناردنی سوپا بۆ دەرسیم دەدەن، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا هەندێك بڕیاری مەترسیدار دەردەکەن: رووخاندنی هەموو دێهاتەکان و ئەوەشیان دەمێنێتەوە دووربخرێنەوە. ٦١

سەبارەت بە ژمارەی شۆڕشگێڕانیش ، بەپێی بەڵگەنامەیەکی بەریتانیا ژمارە ١١٢ی بەرواری ٢٢ی مایسی ١٩٣٧ کە نوێنەری بەریتانیا لە ئەستەنبول بۆ وەزیری دەرەوەی وڵاتەکەی ناردووە، هاتووە، کە ژمارەی یاخیە کوردەکان ( ١٥ هەزار ) کەس زیاترە و بەردەوام زیانی گەورە لە هێزەکانی تورك دەدەن.٦٢

شەڕ و ڕووبەڕووبونەوە لە نێوان شۆڕشگێڕانی سەید ڕەزای دەرسیم و هێزەکانی دەوڵەتی تورکیادا ڕوودەدات و شۆڕش بەردەوام دەبێت، لە دوایین هێرشدا سەید ڕەزا بە پلانێکی تۆکمەوە پەلاماری هێزەکانی ئەتاتورک دەدات و گورزی کاریگەریان لێدەوەشێنێت، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ( جەنەراڵ دۆغان ) داوای دانوستان لە سەید ڕەزا بکات و ئەویش داواکەی قبوڵ دەکات، وە بۆ وتووێژ بەرەو ( ئەرزنجان ) دەڕوات، بەپێی پلانێکی نەخشە بۆ ڕێژراو لە ڕۆژی ١٩٣٧/٩/٥ هەموو ڕێبەرانی دەرسیم دەستگیر دەکرێن و بۆ شاری ( العزین ) ڕەوانە دەکرێن، ڕۆژی ١٩٣٧/١١/١٠ بە ئامادەبوونی ئەتاتورک دادگایی سەید ڕەزا و یارانی دەست پێ دەکات و لەو دادگایەدا سەید ڕەزا و ٢٢٧ کەس لە یارانی بە سزای لە سێدارەدان و ٣ کەسیشیان بە سزای هەتا هەتایی زیندانی دەکرێن و لە ١٩٣٧/١١/١٨ بەرپرسانی تورک سەید ڕەزا و هاوڕێکانی لە شاری ( العزیز ) لەسێدارەدا. ٦٣

**بڕوانە وێنەی ژمارە ٣ دادگاییکردنی سەید ڕەزا و هاوڕێکانی**



لەگەڵ ئەوەی لە دوای لە سێدارەدانی سەید رەزا و هاوڕێکانی شۆرش و ناڕەزایی بەردەوام بوو بەڵام حکومەتی تورکیاش بەردەوام بوو لە هێرش و پەلامارەکانی، بەڵام حکومەتی تورکیا بۆ سەرکەوتنی پلانەکەی پرۆسەی سەرکوتکردنی کوردی بۆ چەند قۆناغێك دابەشکرد، لە بەیاننامەیەکدا کە ئەرکانی سوپای تورکیا دەریکردووە، دەڵێت: ئەو موناوەرەیە لە قۆناغی یەکەمدا هەموو ناوچەی دەرسیم دەگرێتەوە... بەم جۆرەش ئەنجام دەدرێت، لە هەموو لایەکی ناوچەکە دەستی پێ دەکرێت، دەبێت بە کەمترین کات و بە توندی و کاریگەرانە یاخیبوان لە هەر کوێیەکدا هەبن و خۆیان شاردبێتەوە لەناویانبەرن و نەهێڵن دزە بکەنە شوێن و ناوچەکانی دیکە.٦٤

هاوکات لە تەلەگرافێکدا بۆ مستەفا کەمال لە ٣٠ی ئابی ١٩٣٨، فەوزی چەقماق سەرۆکی ئەرکانی سوپای تورکیا ئاماژە بەوە دەکات قۆناغی یەکەم و دووەمی موناوەرەکە کۆتایی هات، لە یەکی ئەیلولی ١٩٣٨ قۆناغی سێیەم دەست پێ دەکەین.٦٥

ئەگەر بەراوردی ئەم پلانە و قۆناغەکانی بکەیت، زۆر لە پلان و قۆناغەکانی ئەنفال دەچێت بەوەی رژێمی بەعس پرۆسەی ئەنفالی دابەشکردبوو بۆ ٨ قۆناغ ، هاوکات بە پێی بریاری ژمارە ( ٢٨ / ٤٠٠٨ ) کە لە ٢٠ / ٦ / ١٩٨٧ دا دەرچوو بە یەکجاری پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئیتر سیاسەتی کوشتن و وێران کردن لە ٢٢ / ٦ /١٩٨٧ لە دێهاتە قەدەغەکراوەکاندا پیادە دەکرێت ئەم بڕیارەش لە لایەن عەلی حەسەن مەجید، رازگری نوسینگەی باکووری حیزبی بەعس، دەرچووە و کە پلان بوو بۆ وێرانکردنی گوندەکان و لەناوبردنی گوندنشینان. ٦٦

بەو پێیەش رووداوەکانی دێرسیم لە سێ قۆناغدا چڕ دەکرێتەوە لەوانە:.

یەکەم: لە کاتی دانانی یاسای نائاسایی لە ساڵی ١٩٣٥ تا سەرەتای ١٩٣٧، دەوڵەتی تورکی هەوڵیدا کۆنترۆڵی دێرسیم بکات. لەو ماوەیەدا سوپا و هێزی ئاسمانی دامەزران.

دووەم: لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٣٧، ژمارەیەکی زۆری سەرباز هێنرانە ناوچەکە تاوەکو بەرهەڵستکاری هەرێمی سەرکوت بکات، بەڵام تەنها هێرشیان نەکردەسەر شۆرشگێران بەڵکو کورد بەگشتی. لەم قۆناخەدا مرۆڤ دەبینێت، ئامانج پاکتاوکردنی نەژادی بووە لە دێریسم. بۆمبابارنکردنی هەوایی یەکێك بووە لە میتۆدەکان. لە کۆتایی هاویندا سەرکردەی شۆڕشگێران لەسێدارە درا و شۆڕشەکە بە شێوەیەکی گشتی خامۆشکرا، ئەگەرچی هەوڵوتەقەلای پاکتاوکردنی نەژادی بەتەواوەتی کۆتای پیێ نەهاتبوو.

سێیەم: هاوینی ساڵی ١٩٣٨، لە کاتی داگیرکاریەکاندا ژمارەیەکی زۆرتر سەرباز بەشدارییان تێدا کرد و زیانێکی گەورەیان لە کوردەکاندا، کورد بە شێوەیەکی بەربڵاو ڕاگوێزران و ئابووری ناوچەکە تێکوپێکدرا، پاکتاوی نەژادی جێبەجێ کراو و خێزانە دوورخراوەکان تا چەندین ساڵ دوای ئەوە بۆیان نەبوو بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکەیان.٦٧

بڕوانە وێنەی ژمارە ٤



## سێیەم/ کۆمەڵکوژیەکەی دەرسیم

هاوشێوەی پرۆسەی ئەنفال کە لە سێ قۆناغدا هاوڵاتیان لەناو دەبران، دەستگیرکردن ، کۆکردنەوە، زیندەبەچاڵکردن، کۆمەڵکوژی دەرسیمیش بە هەمان شێوە، دوای سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی سەید ڕەزا، کەوتنە کوشتن و لەناوبردنی هاولاتیان و کاولکردنی گوندەکانیان.

هەروەك عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆکایەتی وەزیران لە ١٩٣٧/٥/٢ بڕیارێکی دەرکرد کە لەڕێگای داگیرکردنەوە کۆتایی بە بەرەهەڵستکردنی دووروودرێژی دێرسیم بهێنرێت و رایگەیاند: دەبێت ئەمجارە خەڵکی هەرێمی سەرهەڵداوان کۆبکرێنەوە و رابگوێزرێن، فەرمان بە سوپا کرا کە بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ پیاوانی شۆڕشگێڕ بکات، لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەی کە چەکیان هەڵگرتووە، یانیش هێشتا چەکیان پێیە، بۆ هەمیشە لەناویان بەرن و بەتەواوەتی گوندەکانیان کاولوویران بکەن و خێزانەکانیان دووربخەنەوە.٦٨

سوپای تورکیا هێرشەکانی بۆسەر گوندەکان لە دوای شۆرش دەستپێکردووە و لە هەرگوندێکدا هاولاتیانیان کۆکردۆتەوە و گوللە بارانیان کردوون، زۆرجار هاولاتیانی چەند گوندێك کۆکراونەتەوە و پێکەوە گوللەباران کراون، بۆ نمونە سوپا هاولاتیانی ژمارەیەك گوندی هۆزی حەیدەریە کۆدەکاتەوە و کە نزیکەی ( ٦٠٠ بۆ ٧٠٠ ) کەس دەبن و هەموویان پێکەوە گوللەباران دەکات. ٦٩



بڕوانە وێنەی ژمارە ٥

سەربازان زۆر بێبەزەییانە ژن و منداڵانیان گرتووە و کوشتویانن، هەر وەك دیبلۆماتێکی بەریتانی نووسیویەتی زۆر سەرچاوە ئەوەیان پشتڕاست کردۆتەوە کە لە کاتی پاکتاوکردنی ئەو ناوچە کوردییە (مەبەست لە دێرسیمە)، دامودەزگا سەربازییەکان هاوشێوەی ئەو میتۆدانەیان بە کار هێناوە کە لە سەردەمی جەنگدا بە دژی ئەرمەنییەکان بە کاریان هێناوە: هەزاران کورد بە ژن و منداڵەوە کوژران" ئەوانی دیکە کە زۆربەیان منداڵ بوون فڕێدرانە ناو ئاوی رووبای فوراتەوە" هاوکات هەزاران کەسی دیکە کە کەمتر وەکو دوژمن چاویان لێکراوە دوای ئەوەی دەستگیراوە بەسەر مەڕوماڵات و سەروەتوسامانیاندا بۆ ناوەراستی ئەنادۆڵ راگوێزراون.٧٠

سەبارەت بە ژمارەی قوربانیانی کۆمەڵکوژیەکەی دێرسیم تا ئێستا ئامارێکی رەسمی نیە بەڵام بە شێوەیەکی نافەرمی سەرچاوەکان ژمارەی قوربانیانیان راگەیاندووە، ژمارەی تەواوەتی قوربانییەکان بە گوێرەی راپۆرتێك لە لایەن چاودێری هێزەکانی سوپاوە و رۆژنامەی رادیکاڵ وەکو سەرچاوە نیشانی دەدات، (١٣ هەزارو ١٦٠ ) کەس کوژراون و ( ١١ هەزارو ٨١٨ ) کەسیشی راگوێزراون. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە (٧٠هەزار) کەس بووە، ئەوا لە ٣٥٪ دانیشتوانەکەی لە دەست داوە. دیار نییە کە ئاخۆ سوپا ئەو ژمارەیەی لەسەر چ بنەمایەك دەرخستووە. بەڵام بە ئیحتیمالێکی زۆر ئەوان تەنها ئەوانەیان حساب کردبێت کە راستەوخۆ لە شەڕەکاندا کوژرا بێتن، نەك ئەوانەی کە دواتر بە هۆی برینداریيەوە گیانیان لە دەست داوە، یانیش خەڵکانی دیکە بێچەك کە بە هۆی دژواریەوە لە کاتی راکردنیاندا گیانیان لە دەست داوە لە نێو شاخە بەرزەکاندا. زانیاری زیاتر کە لە لایەن کوردەکان بڵاو دەکرێتەوە، باسی ٤٠ هەزار کوژراو دەکات، بەڵام زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت پشتڕاستیان بکاتەوە. ٧١

بەڵام بەپێی ئاماری فەرمی دەوڵەتی تورکیا، لەساڵی ١٩٣٧ دا ( ١٠ هەزار و ٧٣٧) کەس و لە ساڵی ١٩٣٨ یشدا ( ٦ هەزار و ٨٦٨ ) ژیانیان لە دەست داوە.٧٢ بەڵام ژمارەیەکی کەم لە کوشتاری دەرسیم کە بە فەرمی تۆمارکراوە، بڵاو کراوەتەوە. ٧٣

**بڕوانە خشتەی ژمارە ٢**

لە ساڵی ١٩٣٧ ئەو پیاوانەی کە کوژراون لە دێرسیم

| ز | ڕەگەز | تەمەن لەنێوان | ژمارەی قوربانی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | نێر | ٠-٩ | ٢٣٨ | ١٩٣٧ |
| ٢ | نێر | ١٠-١٩ | ١٠٨ | ١٩٣٧ |
| ٣ | نێر | ٢٠-٢٩ | ٦٠ | ١٩٣٧ |
| ٤ | نێر | ٣٠-٣٩ | ٩٥ | ١٩٣٧ |
| ٥ | نێر | ٤٠-٤٩ | ١٠٣ | ١٩٣٧ |
| ٦ | نێر | ٥٠-٥٩ | ١٢٣ | ١٩٣٧ |
| ٧ | نێر | ٦٠-٦٩ | ٨٨ | ١٩٣٧ |
| ٨ | نێر | ٧٠ و ..... | ٨٩ | ١٩٣٧ |

لە ساڵی ١٩٣٧ ئەو ژنانەی کە کوژراون لە دێرسیم

| ز | ڕەگەز | تەمەن لەنێوان | ژمارەی قوربانی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مێ | ٠-٩ | ٢٢٦ | ١٩٣٧ |
| ٢ | مێ | ١٠-١٩ | ١٣٧ | ١٩٣٧ |
| ٣ | مێ | ٢٠-٢٩ | ٦٣ | ١٩٣٧ |
| ٤ | مێ | ٣٠-٣٩ | ١٠٩ | ١٩٣٧ |
| ٥ | مێ | ٤٠-٤٩ | ٩٢ | ١٩٣٧ |
| ٦ | مێ | ٥٠-٥٩ | ٩١ | ١٩٣٧ |
| ٧ | مێ | ٦٠-٦٩ | ٦٥ | ١٩٣٧ |
| ٨ | مێ | ٧٠ و ..... | ٧٦ | ١٩٣٧ |

## نەخشەی ژمارە ٣

### لە ساڵی ١٩٣٨ ئەو پیاوانەی کە کوژراون لە دێرسیم

| ژ | رەگەز | تەمەن لەنێوان | ژمارەی قوربانی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | نێر | ٠-٩ | ٨٤٠ | ١٩٣٨ |
| ٢ | نێر | ١٠-١٩ | ٥٣٥ | ١٩٣٨ |
| ٣ | نێر | ٢٠-٢٩ | ٢٥٠ | ١٩٣٨ |
| ٤ | نێر | ٣٠-٣٩ | ٣٣٢ | ١٩٣٨ |
| ٥ | نێر | ٤٠-٤٩ | ٤١٩ | ١٩٣٨ |
| ٦ | نێر | ٥٠-٥٩ | ٣٨٢ | ١٩٣٨ |
| ٧ | نێر | ٦٠-٦٩ | ٢٨٤ | ١٩٣٨ |
| ٨ | نێر | ٧٠ و...... | ٣٩٣ | ١٩٣٨ |

### لە ساڵی ١٩٣٨ ئەو ژنانەی کە کوژراون لە دێرسیم

| ژ | رەگەز | تەمەن لەنێوان | ژمارەی قوربانی | ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مێ | ٠-٩ | ٧٠٧ | ١٩٣٨ |
| ٢ | مێ | ١٠-١٩ | ٧٢٩ | ١٩٣٨ |
| ٣ | مێ | ٢٠-٢٩ | ٣٥٤ | ١٩٣٨ |
| ٤ | مێ | ٣٠-٣٩ | ٤٢١ | ١٩٣٨ |
| ٥ | مێ | ٤٠-٤٩ | ٢٨٧ | ١٩٣٨ |
| ٦ | مێ | ٥٠-٥٩ | ٣٢٩ | ١٩٣٨ |
| ٧ | مێ | ٦٠-٦٩ | ٢٢٨ | ١٩٣٨ |
| ٨ | مێ | ٧٠ و...... | ٢٥٨ | ١٩٣٨ |

## چوارەم/ چیرۆکەکانی مەرگ لە دەرسیم و ئەنفال

لە نێوان پرۆسەی ئەنفال و کۆمەڵکوژی دەرسیمدا دەیان چیرۆکی هاوشێوە هەیە کە لە کۆمەڵکوژیەکاندا لە بەردەم گوللەی سەربازەکان بە قەدەر رزگاریان بووە، تەنانەت هەندێك لە چیرۆکەکان کە لە زمانی رزگاربووانەوە گێڕدراوەتەوە ئەگەر ناوەکەیان لابرێت هەمان چیرۆکن و هەست ناکرێت دوو روداوی جیاواز بن، رووداوەکانیش لە زاری رزگاربووان خۆیانەوەیە، لێرەدا سێ بەراوردی چەند چیرۆکێکی رزگاربووانی هەردوو روداوی ئەنفال و دەرسیم دەکەین، وەك دوو کۆمەڵکوژی هاوشێوە، کە یەکێکیان بە دەستی سەربازانی مستەفا کەماڵ ئەتاتورك لە ساڵانی ١٩٣٧ و ١٩٣٨ و ئەوی دیکەشیان بە دەستی سەربازانی رژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٨٨.

حەسەنێ ئیبراهیم ئاغا، کە خەڵکی گوندی ( مەرخۆ) یەو لە کاتی کوشتارەکەی دەرسیمدا منداڵ بووە و دێیەکەی ئەمانیش بەر کوشتار کەوتوون ئاماژە بەوە دەکات: کە سەربازەکان هاتن و ئێمەیان گرت و کۆیانکردینەوە، دایکم منی خستە ژێر کراسەکەی و گوتی: ئەگەر کەوتم لەژێرەوە چاوەڕێ بکەو زوو دەرمەچۆ تا سەربازەکان دەڕۆن، بەڵکو رزگارت دەبێت، لە کاتی گوللەبارانکردنمان من لەژێر کراسەکەی دایکم بووم، دایکم بەرکەوت و کەوت، منیش لەژێرەوە مامەوە، ماوەیەك تێپەڕی، سەربازەکان رۆیشتن، بەڵام زۆر دوور نەکەوتبوونەوە، منداڵێك لەو کاتەدا دەگریا، سەربازەکان هەمدیسان هاتن و و گەڕان و منداڵەکەیان دۆزیەوە، هیچی لێنەهاتبوو بەڵام کوشتیان، هەر چەندە حەسەنێ لە ترسان دەبورێتەوە، بەڵام دواتر بەئاگا دێتەوە و هەڵدەستێت و لەو ناوە دوور دەکەوێتەوە و شوانێك دەبینێت و لەگەڵ خۆی دەیبات. ٧٤

ئەم رووداوە دوای ٥٠ ساڵ کوتومت لە پرۆسەی ئەنفالدا دووبارە بۆتەوە، تەیمور عەبدوڵا ئەو منداڵە ١٢ ساڵەی کە خەڵکی کوڵەجۆی سەر بە ناحیەی تیلەکۆی گەرمیانە، دوای ئەوەی بە ئۆتۆمبیلی تایبەت دەیان بەن و لە چۆڵەوانییەکی خواری عێراق، چاڵیان بۆ هەڵدەکەن و دەیانکەنە چاڵەکەوە و گوللەبارانیان دەکەن لەو

کاتەدا تەیمور لە دایك و خۆشکەکانی دادەبرێت و ئەوان دەکوژرێن، بەڵام گوللەیەك بەر شانی تەیمور دەکەوێت، بەڵام دوای ئەوەی سەربازەکان کارەکەیان تەواو دەکەن دەڕۆن، لەو تاریکی شەوەدا تەیمور هەست بە جوڵەیەك دەکات لەو لای خۆیەوە تەماشا دەکات کچێکی منداڵە و گولەی بەر نەکەوتووە، ئەوجا تەیمور پێی دەڵێت با راکەین بەلام کچەکە دەڵێت ناتوانم زۆر لە سەربازەکان دەترسم، بەڵام تەیمور رانەوەستاوە و لە چاڵەکە دەردەچێت و رادەکات، دواتر ناوچەکە جیێ دێلێت و دەگاتە ماڵێکی رەشماڵنشین کە سەرقاڵی مەڕدارین و لەویێ دەمێنێتەوە. ٧٥

ئەم دوو چیرۆکە لە دەیان رووەوە لە یەك دەچن، ئەگەرچی ٥٠ ساڵ جیاوازیان هەیە یەکەمیان ١٩٣٨ رووی داوە و دووەمیان ١٩٨٨ ، هەردووکیان منداڵ بوون، هەردووکیان دایك و خۆشکەکانیان کوژران، هەردووکیان منداڵ دەبینن کە زیندوو بووە، هەردووکیان رادەکەن و شوان دەیانگرێتە ئەستۆ.

لە کوشتن و قەتلوعامکردنی هاولاتیانی کورددا سوپای تورکی دەستی نە پاراستووە لەو هاوڵاتیە کوردانەش کە لەگەڵ حکومەتدا کاریان کردووە، کەسوکاری ئەو کەسانەش کوژراون کە سەربازی حکومەتی تورکیا بوون، هەر وەك چۆن لە پرۆسەی ئەنفالدا هەرگیز سوپای عێراق دەستی نە پاراستووە لەو کەسانەش کە لەگەڵ حکومەتی عێراق بوونە.

ئیڤرایمێ حەسەنێ عەلیێ ئاڤاشی ، کە خەڵکی گوندی ( بێرەسك )ی سەربە قەزای ( دەرسیم — تونجەلی) ە، خۆی لە کۆمەڵکوژیەکەی دەرسیم رزگاری بووە ئاماژە بەوە دەکات کە دوای ئەوەی مام و خێزانەکەی و چەندین ژن و منداڵی دیکەیان کوشت، موسای ئامۆزام لە سەربازی بوو عەسکەری بۆ دەوڵەت دەکرد، ئەو کاتە بە مۆڵەت گەڕابووەوە گوندەکەمان. دەبینێت خێزانەکەیان بردووە ئەویش بە جلی سەربازیەوە، یەك راست دەچێتە لایان و دەڵێت ( تەماشاکەن منیش وەکو ئێوە سەربازم بە مۆڵەت گەڕاومەتەوە، ئێوە بۆ دایکم و باوکم و خۆشکەکانمتان هێناوە

؟ چۆن دەبێت؟! هەر كە وا دەڵێت، ئەویش باڵبەست دەكەن و لەوێدا دەڵێت: سەربازیمان بۆ دەوڵەت كرد و بەكارمان نەهات، هەر لەوێدا دایكوباوكی گوللەباران دەكەن. ٧٦

هاوكات لە پرۆسەی ئەنفالدا خێزان و منداڵەكانی هاوڵاتی ( عاصی مستەفا ئەحمەد ) كە خەڵكی شاری چەمچەماڵە، كە سەربازی سوپای عێراقی دەبێت و دیلی ئێران دەبێت دوای گەڕانەوەی لە دیلی لە ساڵی ١٩٩٠ ئازاد دەكرێت و دەبینێت ژن و منداڵەكەی نەماون و ئەویش نامەیەك ئاڕاستەی سەرۆك كۆماری عێراق دەكات و داوای چارەنووسیان دەكات، بەڵام نوسینگەی سەرۆك كۆماری عێراق وەڵامی عاسی مستەفا ئەحمەد دەداتەوە و دەڵێت: ئاماژە بە بەزەیی نامەكەت لە ٤ ی تشرینی یەكەمدا ، ژنەكەت و منالەكانت لە سەردەمی عەمەلیاتی ئەنفالدا كەوا لە ساڵی ١٩٨٨ لە ناوچەی باكووردا ئەنجام دراوە ون بون . ٧٧

هاوكات لە كۆمەڵكوژی دەرسیمدا دەیان چیرۆكی كوشتن و گولەبارانكردنی تیایە كە لە زۆر رووەوە هاوشێوەی چیرۆكەكانی ئەنفالە ، ئۆسێنی ئیڤرایمی، دێیەكەمان ناوی ( ئاموتقە) یە و سەر بە هۆزی ( قۆچانین)، ئەو باس لە كۆمەڵكوژیەكەی دەرسیم دەكات و دەڵێت، دوای ئەوەی سەربازەكان هاتن ئێمەیان كۆكردەوەو ، دواتر ریزیان كردین و بەستیانینەوە، بەڵام بەرە بەرە دەستمان كردەوە... بەر لەوەی بڵێن ( Aress ) واتا تەقەبكە، دەستم كردەوە، لەپڕ رامكرد، كە من رامكرد رەشاش دەستی پیَ كرد، ئێمە چوار ، پێنج كەس بووین رامان كرد، بەڵام تەنها من گوللەم بەرنەكەوت، ئەوانی تر كەوتن، شیوێك نزیكمان بوو خۆم هەڵدایە ناو زەل و قامیشەلانەكەوە، من رزگارم بوو، ئەو ژنەش كە رزگاری بوو ناوی ( ئەردیفە ) ،كە تەقەیان لێدەكەن دەكەوێتە ژێر لاشەكانەوە و بە سوكیش بریندار دەبێت، دوای ماوەیەك دێتەوە سەرخۆی و هەڵدەستێت تەماشا دەكات هەموو كوژراون، لەویَ خۆی دەردەكات و دەڕوات.٧٨

بڕوانە وێنەی ژمارە ٦



لە چیرۆکێکی دیکەدا کە کۆمەڵکوژی لە ناوچەیەکی دیاریکراودا نزیکەی ٦٠٠ بۆ ٧٠٠ کەس گوللەباران دەکەن، زەینەڵ قەمەر کە خەڵکی گوندی ( وارتنیگا) یە سەر بە هۆزی ( حەیدەران)ە ئەو لە کاتی کۆمەڵکوژیەکەی دەرسیم تەمەنی ١٣ساڵ بووە، ئاوا ڕووداوی قەتلوعامی ناوچەکەیان دەگێڕێتەوە، ساڵی ١٩٣٨ ئێمەیان بردە ئەوبەری ڕووبار، کە سەر بە هۆزی ( ئالان) بوو، من لە گۆمەمشێ مامەوە،، ڕۆژێك سەربازەکان بە دێکاندا دەگەڕان، هاتنە ئەو دەوروبەرەی ئێمە، بە خەڵکەکەیان گوت: وەرن بۆ زستان زەخیرە و ئازوقەتان دەدەینێ ، ئەو کاتەش دێیەکان چۆڵ کرابوون، مەزرا و خەلەودانەکان لە شوێنی خۆیان ڕزابوون، وتبوویان وەرن گەنموجۆتان دەدەینێ ، دواتر پیاوانی دێ کۆبوونەوە و هەموویان ڕۆیشتن، بەڵام دوو سێ ڕۆژی پێ چوو نەگەڕانەوە، دوای چوار ڕۆژ ئەم جارە سەربازەکان لە ڕێگای موختارەکانەوە خەبەریان بۆ ناردین، دەبێ گەورەوبچوکی ( حەیدەریەکان ) خۆیان تەسلیم بکەن، ئەوەی لە دێکەدا بمێنێتەوە دەیکوژین، ئەمجا خۆیان هاتن و هەموومانیان کۆکردەوە لە گۆمەمشێ دار توو هەبوو، هەموومانیان لەوێدا کۆکردەوە خەڵکێکی زۆریان هێنا بوو، دانیشتوانی ( کورتە سورە ، گۆمە مشێ ، پورتك ، وەلی کاسۆ ) هەموو لەوێدا کۆیانکردینەوە، نزیکەی ( ٦٠٠ بۆ ٧٠٠ )

کەسێك دەبووین، تا ئەو کاتەش هیچ سۆراغی ئەو پیاوانە نە دەزانرا کە بۆ ئازوخە بردبویانن، دەمەوئێوارە ئێمەیان بردە ( وەلیّ باخیّ ) لە ڕێگاکە سەرەوژورێك هەیە، لەوێدا بە دزیەوە هەڵگەڕامە سەر بەرزاییەکە و ڕامکرد، سەربازەکان بینیمیان دەستیانکرد بە تەقە، بەڵام من خۆم ڕزگار کرد، بۆ بەیانی ئەو هەموو مرۆڤانە لە دۆڵێکدا گوللەباران کرابوون، تومەز پیاوەکانیش کە بۆ ئازووقە هێنابوویانن هەر لەوێدا قەتڵوعام کرابوون، ئەو شوێنە کە کۆمەڵکوژییەکەی تیدا ئەنجامدرا، دۆڵی ( زوخوری) پیّ دەڵێن.٧٩

ئەو چیرۆکانەی کۆمەڵکوژی دەرسیم لە ساڵی ١٩٣٧، بە تەواوی لە چیرۆکی ڕزگاربوانی کۆمەڵکوژی ئەنفال دەچێت، ژمارەیەك کەس لە کۆمەڵکوژی ئەنفال لە بیابانەکانی ڕوومادی ڕزگاریان بوو، یەکێك لەوانە فەرەجی تۆپخانەیە ( فەرەج محەمەد عەزیز) لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٠ یەو لە گوندی تۆپخانەی سەر بە ناحیەی قادرکەرەم لەدایك بووە، دوای ئەوەی لە قۆناغی سێیەمی ئەنفالدا دەستگیر دەکرێن و دەبرێن بۆ سەربازگەی تۆپزاوا، دوای چەند ڕۆژێك مانەوە لەویّ، بە سەیارەی تایبەت شەوانە بەش بەش دەیانبەن و بێسەروشوێن دەکرێن، دواتر فەرەج و ساڵحی ئامۆزای لە سەیارەیەکدا بەیەکەوە دەبن و دەیانبەن بۆ مەرگ، دوای ئەوەی شەو دەیانبەن بۆ بیابانی ڕوومادی شەو دەستدەکەن بە گوللەبارانکردنیان و دوو دوو لە ئۆتۆمبیلەکانیان دایاندەگرن و دەستوچاویان دەبەستنەوە و گوللەبارانیان دەکەن، فەرەج کە لەگەڵ ساڵحی ئامۆزایدا بەیەکەوە دەبن لە تاریکە شەودا گوللەبارانیان دەکەن بەڵام فەرەج گوللەی بەرناکەوێت، بەڵام خۆی دەکات بە مردوو دواتر ڕایاندەکێشنە ناو ئەو چاڵانەی بە بلدۆزەر بۆیان هەڵکەنراوە، دوای ئەوەی خۆڵ دەکەن بە سەریاندا فەرەج لە تاریکی شەودا خۆی

دەرباز دەكات و را دەكات و دەربازی دەبێت، بەڵام سەرجەم ئەوانەی كە لەگەڵیدابوون گوللەباران كران و زیندەبەچاڵیان كردن. ٨٠

یەكێكی تر لەو رووداوی كۆمەڵكوژیانەی ئەنفال كە ژمارەیەك كەس تیایدا رزگاریان بوو لە مەرگەساتێكی گەورەدا، هەریەك لە ( عوزێر و عومەر و ئیبراهیم ) بوون كە ئەوانیش لە قۆناغی ئەنفالی سێدا دەستگیركراون و دوای ئەوەی دەگوازرێنەوە بۆ بەندیخانەی تۆپزاوا بەپێی گێڕانەوەی خۆیان لە دەوروبەری ١٥بۆ ١٧ی نیسانی ١٩٨٨، ( واتا چەند رۆژێكی كەم دوای دەستپێكی پرۆسەی ئەنفالی سێ چونكە قۆناغی سێیەمی ئەنفال لە ٧ بۆ ٢٠ی نیسان بەڕێوەچوو لە گەرمیان ) لەو بەندیخانەیەوە بە كۆمەڵ و بە ئۆتۆمبیلی جام داخراو گوازراونەتەوە كە لەو كاروانەدا بە وتەی عوزێر زیاتر لە ٣٥ ئۆتۆمبیل دەبوون و هەریەكەیان نزیكەی ٣٥ كەسی گرتووە، بەرەو بیابانی موسڵ رۆیشتوون، دوای ئەوەی هەست بەوە دەكەن كە لە بیاباندا گوللەبارانیان دەكەن و ئۆتۆمبیلەكەی ئەمان لە دوایین ئۆتۆمبیلەكان بووە، بۆیە كاتێك دەزانن گوللەبارانیان دەكەن، پلان دادەنێن كە هەر كات سەربازەكە هاتە ناو ئۆتۆمبیلەكەیانەوە، ئەوان بە هەموویان پەلاماری بدەن و چەكەكەی لە دەست وەرگرن، هەر بۆیە كاتێك سەربازەكە دێتە ناو پاسەكەیانەوە بۆ ئەوەی بیانبات بۆ گوللەبارانكردن و زیندەبەچاڵكردن، پەلاماری دەدەن و چەكەكەی لێدەستێنن، بەڵام مەخزەنەكەی لەسەر دەردەكات و دواتر سەربازەكانی تر بە هانایەوە دێن و ئەو ئۆتۆمبیلە گوللەباران دەكەن بەلام عوزێر و عومەر و ئیبراهیم لەو كاتەدا لە ئۆتۆمبیلەكە دێنە دەرەوە و دەچنە ژێرەوە، بەڵام دواتر ئەمان رزگاریان دەبێت و سەرجەم سەرنشینەكانی ناو ئۆتۆمبیلەكە گوللەباران دەكەن و زیندەبەچاڵیان دەكەن بەلام عوزێرو عومەر و ئیبراهیم هەر یەكە و بە لایەكدا رادەكەن و كە هەر یەكەیان بە سووكی بریندار دەبن بەڵام رزگاریان دەبێت دوای ئەوەی بەسەر چەندین چاڵی پڕ لە لاشەی گوللەباران كراودا رادەكەن. ٨١

## پێنجەم/ ژن لە کۆمەڵکوژی دەرسیم و ئەنفالدا

هەمیشە لە جەنگ و شەڕ و کوشتارەکاندا ژنان و منداڵان دەبنە قوربانی ئەو جەنگانە، لە مێژووی کورددا دەیان ڕوودا و کارەسات و کوشت و کوشتار بەسەر گەلی کورددا هاتووە، لە زۆربەی ئەو جەنگانەدا ژنان بوونەتە قوربانی و ڕووبەڕووی دەستدرێژی و کوشت و کوشتار بوونەتەوە، کۆمەڵکوژی و کوشتاری دەرسیم لە ساڵەکانی ١٩٣٧ و ١٩٣٨ سەرەرای وێرانکردنی گوندەکان و کوشتنی پیرو گەنج و لاوانی کورد، لە تەواوی ئەو هەڵمەتەدا ژنان و کچان بونەتە قوربانی و لاقەکراون و دەستدرێژیان کراوەتە سەر، دواتریش لە جینۆسایدی کوردە فەیلیەکان و راگواستنیان لە ساڵی ١٩٨٠، بەشێك لە ژنانی فەیلیەکان فرۆشراون بە وڵاتان یان شێخ و سەرۆك عەشیرەتەکان، دواتریش لە پرۆسەکانی ئەنفالدا لە ساڵی ١٩٨٨ دا سەرەڕای دەستدرێژیکردنی سەربازانی سوپا بۆ سەر ژنان و کچان و زیندەبەچاڵکردنیان، بە سەدانیشیان لێ فرۆشراوە بە وڵاتانی میسر و سعودیە و کەنداو و لەناوخۆی عێراقیشدا وەك دیاری دراوە به سەرۆك عەشیرەت و ئەفسەرەکانی سوپا.

گەر بەراوردێك بکەین لە نێوان رەوشی ژنان لە کوشتاری دەرسیم و پرۆسەی ئەنفالدا، لە زۆر رووەوە رووداوەکان و گێڕانەوەکان لەیەك دەچن و هاوشێوەن، لێرەدا بەراوردی دوو رووداو دەکەین کە چۆن ژنان بونەتە قوربانی لە درەسیم و ئەنفالدا.

بێزا خدێ ئاوزەتی کە لە قەتڵوعامەکەی ١٩٣٨ی دێرسیم بەرکەوتووە دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: سەرەڕای کوشتن و قەتڵوعامکردنی هاوڵاتیان و کۆمەڵکوژیان پێکەوە، بەبێ جیاوازی ژن و پیاو و پیر و گەنج و منداڵ، دەستدرێژی کردنە سەر ناموسی ژنانی کورد لە لایەن سەرباز و جەندرمەکانەوە رویانداوە، لەوانە ژنەکەی ( ئیڤیکا تەمەر ئاغا ) ناوی ( سەدرە ) بوو، زۆر جوان بوو، دوای لاقەکردنی کوشتویانە، کچەکەی جەمشید ئاغا ناوی ( چاکی ) بوو، خێزانی (تەسلیم ئەیوب ئاغا ) بوو، لە نێوان دێی ( ئنێ ) و ( ئینجیفە )دا، راستاییەك هەیە، لەوێ دوای دەستدرێژیکردنە سەری کوشتیان.

شوانێك چاوی پێوە دەبێت چی لەو ژنە دەکەن لە پێشدا منداڵێکی بە باوەشەوە دەبێت منداڵەکەی لێدەستێنن، تا دەستیان بیگرێت وەکو بەردێك فرێی دەدەن، کە وا دەکەن ( چاکی ) هاوار دەکات ، شوانەکە دەڵێت، قیژەکەی لەو دەشتە دەنگی دایەوە، ئەوجا، کەوتنە سەرخۆی، ژنەیان پاڵخست، قاچیان لەیەك ترازان، بەو حاڵە دەستدرێژیان کردەسەری دوا جاریش کوشتیان. ٨٢

**بڕوانە وێنەی ژمارە ٧**



لە بەشێکی تردا بێزا خدێ ئاوزەتی، ئاماژە بە لاقەکردنی کچان دەکات لە لایەن سەربازانی سوپای تورکیاوە و دەڵێت: بینیم لاشەی چەند کەسێکی تر کەوتبوون بە سونگە سکیان هەڵتلیشابوو... ئافرەتەکان لەشیان بەدەشتەوە بوو... لاقەی کچی عازەبیان کردبوو، بەو خوێنەدا دیار بوو کە لەناو گەڵیاندا رژابووە سەر خۆڵەکە...!! وەکو دەگێڕنەوە لەناو ئەو گروپەدا، یەکێك لە سەربازەکان خەڵکی دێکەیان دەبێت، ژنەکە دەناسێت... دەبینێت زۆر دەپاڕێتەوە ( ناموسم بپارێزن ... بمکوژن )، ئەو سەربازەی کە دەیناسێت گوللەیەکی پێوە دەنێت تا دەست بۆ نامووسی درێژ نەکرێت. ٨٣

وە لە کاتی کوشتاری کوردانی دەرسیمدا سەربازەکان بۆ ئازاردانی کوردان، ئافرەتەکانیان رووتکردۆتەوە و لە بەرچاوی پیاوەکانیان دەستدرێیان کردوونەتە سەریان و پاشان گوللەبارانیان کردوون.

بڕوانه وێنەی ژماره ٨



رەحمە عبالکریم دەربازبووەیەکی ئەنفال دەڵێت ( بە چاوی خۆم لە سەربازگەی تۆپزاوا دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەتانم بینیوە ، کچێکی زۆر جوان کە ناوی بەیان بوو خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی قەرەحەسەن بوو ، تەمەنی " ١٤ - ١٥ " ساڵ بوو عەسکەرەکان پەلاماریاندا ، هەر ئەو شەوە لە تاوا شێت بوو دوایی لە قاعەکان بە زنجیر دەیانبەستەوە بە پەنجەرەکانەوە ) رەحمە عبدالکریم ئاماژە بەوەش دەکات :( دوو هەفتە بوو برابوینە دوبز ، رۆژێك کۆمەڵێك سەیارەی جام رەش هاتن، هەمووی عەرەبی دزداشە لەبەر بوون بە ناو قاعەکەدا دەگەڕان ، زابتی قاعەکەی ئێمە پیاوێکی باش بوو پێی ووتین هەرچی ژنی جوان و جەحێڵ هەیە لەچکەکانتان لە دەموچاوتانەوە بئاڵێنن ، ئەمانە هاتوون هەرچی جوان بێت و عەقڵیان بیبرێت دەیبەن بۆ خۆیان ، کۆمەڵێکیان جیاکردەوە و بردیانن ). ٨٤

هاوکات لە بەندیخانەکانی رژێمدا کە ژن و پیاوبان لێك جیاکردبووە، زۆر دیمەنی ترسناك و دەستدرێژیان دیوە، ئافرەتی بە قژ هەڵواسراو مەمکیان بڕابووەوە یان چاویان هەڵکۆڵدرابوو، نینۆکەکانیشیان هەڵکێشرابوو. ٨٥

ئافرەتێکی هەڵهاتووی عەرعەر دەیگێڕێتەوە: رۆژی وا هەبووە دوانزە پیاو هاتوونەتە لام و دەستدرێژیان کردۆتە سەر ناموسم. ٨٦

## سەرچاوەكانی بەشی یەكەم


١. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجیەكانی، چاپی یەكەم، سلێمانی ٢٠٠٥، لاپەرە٢٨.

٢. لويس معلوف ـ المنجد ، الطبعة خامسة والثلاثون ، ص ٨٢٨ .

٣. ابي الغداء اسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي، تفسير القران العظيم، الرياض، ج٢، ٢٠٠٢م، ض ١٧٧.

٤. راغب الاصفهاني ـ الفلظ القران ، دارالقلم ديمشق ، ١٩٩٢ ،ص ،٨٢ .

٥. راغب الاصفهانی، هەمان سەرچاوە، لا ٨٢ .

٦. سورەتی ئەنفال ، ئایەتی (١).

٧. عەبدولرەحمان سدیق، ئەنفال لە روانگەی ئیسلامەوە، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ( ٢٤ ) ٢٠٠٢ ، لا ٨٨– ٣٨٩.

٨. سورەتی الانسان ، ئایەتی ( ٨).

٩. د. محەمەد گەزنەیی، كورد قڕانی ساڵی ١٩٨٨ و هۆكارەكانی ناونانی بە ئەنفال، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە( ٢٤) ، ٢٠٠٢، لا ٣١٧ – ٣١٨ .

١٠. عبدالرحمان صديق ، ئەنفال لەروانگەی ئاینی ئیسلامەوە گۆڤاری پەیامی راستی ، ژمارە (٦٥)، ئازاری ٢٠٠٢ هەولێر .

١١. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٣.

١٢. میدڵ ئیست ووچ، جینۆساید لەعێراقداو پەلاماری ئەنفال بۆسەركورد، و.سیامەندی موفتی زادە، چاپی یەكەم، سلێمانی ،١٩٩٩، لاپەڕە ١٢٦ .

١٣. كنعان مكية، قصوة والصمت، منشورات هيئة الارسال العراقية، طبع الاول، ١٩٩٦، ص ١١٠ .

١٤. تۆفیق عەبدوول، ئەنفالەکان و رایەکی تایبەت سەیارەت بە چارەنوسیان، گۆڤاری ئاران، ژمارە ٦،لا ٦٩.

١٥. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٥.

١٦. میدلّ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٢٨ .

١٧. شۆڕش حاجی رەسول، ئەنفال، کوردو دەوڵەتی عێراق، چاپی دووەم ٢٠٠٣، لاپەڕە ٨٣.

١٨. زیاد عبدالرحمن، توونی مەرگ، هێرشەکانی ئەنفال لە بەڵگەنامەکانی رژێمدا، تەورێز ١٩٩٥، لاپەرە ٢١٧.

١٩. شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٧.

٢٠. شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٧.

٢١. میدلّ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٩٥.

٢٢. نەوشیروان مستەفا ئەمین ـ سەچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٤٦

٢٣. بەهجەت رەئوف ـ بیرەوەری ئەنفالی بەدناوی یەك ، روژنامەی کوردستانی نویّ ، ژ (٤٥٥ ) ١٩٩٣/٨/٦.

٢٤. شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٨.

٢٥. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٧.

٢٦.کوردستانی نویّ ، ژمارە ٦٧ ، ١٥ /٤ /,١٩٩٢

٢٧. زیاد عبدالرحمان ـ سەرچاوەی پێشوو ، لا ١٢٤ .

٢٨. رۆژنامەی هاوکاری ، ژمارە ( ٩٥٣) ، ١٩٨٨/٤/٤ .

٢٩. میدلّ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٢٤١.

٣٠. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,٧٢

٣١.نامیدە تاڵەبانی، جاسم محەمەد، ئەنفالی گەرمیان، رەهەندە دیمۆگرافی، ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٢ ، لاپەرە ,٣٠

٣٢.زیاد عبدالرحمان ـ سەرچاوەی پێشوو ، لا ٨ .

٣٣.زیاد عبدالرحمان ـ سەرچاوەی پێشوو ، لا ١٢٤ .

٣٤. چنار نامق، جینۆساید و ئەنفالی کورد، چاپی یەکەم ٢٠١٣، لاپەرە ,٧٢

٣٥.شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٥.

٣٦. یوسف دزەیی، ئەنفال ، کارەسات، ئەنجام و رەهەندەکانی، چاپی یەکەم هەولێر، ٢٠٠١، لا ,١٢٠

٣٧. زیاد عبدالرحمان ـ سەرچاوەی پێشوو ، لا ١٢٤ .

٣٨. کەریم عبدالله هەرتەلی ـ کارەساتی گوندی (وەرە) ، ئاڵای ئازادی ، ژ ـ (١٢٠) .

٣٩. میدڵ ئیست ووچ ـ سەرچاوەی پێشوو ،لاپەڕە ٣٥٧ .

٤٠. یوسف دزەیی، تاونی ئەنفال بەرامبەر کورد ، گۆڤاری سەنتەری برایەتی ، ژ ١٩ ،٢٠٠١ ، لا ٤٢ .

٤١. شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١١٧

٤٢. میدڵ ئیست ووچ ـ سەرچاوەی پێشوو ،لاپەڕە ٤٣٨ .

٤٣. شۆڕش حاجی رەسول، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١١٨

٤٤. میدڵ ئیست ووچ ـ سەرچاوەی پێشوو ،لاپەڕە ,٤٨٠

٤٥. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,٨٢

٤٦. میدڵ ئیست ووچ ـ سەرچاوەی پێشوو ،لاپەڕە ,٢٤

٤٧. میدڵ ئیست ووچ ـ سەرچاوەی پێشوو ،لاپەڕە ,١٧

٤٨. تۆفیق عەبدوول، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٦٧

٤٩.پ.د. ئازاد محەمەد ئەمین نەقشبەندی، ئۆپەراسیۆنەکانی ئەنفال، چەند تێبینیەك و سیما سەرەکیەکانی، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ٤، ٢٠٠٢، لا ,١٠٣

٥٠. خالید سالح، ئەنفال جینۆسایدی کورد لە عێراقدا ، و. کاوە جەمال، گۆڤاری رەهەند، ژمارە ٧، ١٩٩٩.لا,١٠١

٥١. یوسف دزەیی، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,١٥٢

٥٢. د.مارف عومەر گوڵ، جینۆسایدی گەلی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێودەوڵەتاندا، چاپی یەکەم، ١٩٩٧، ئەمستردام، لا٦٥

٥٣.ئەنفال، گۆڤاری خاك، ساڵی سێیەم، ژمارە ٢٤، ١٠ی نیسانی ,٢٠٠٠

٥٤. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە٨٥، ,٨٦

٥٥. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، راپەرینی دێرسیم لە ساڵی ١٩٣٧ – ١٩٣٨ و پرسیار لەمەڕ کۆمەڵکوژی، رۆژنامەی رووداو ، ژمارە ١٨٩، دوشەممە ٢٠١١/١٢/٥.

٥٦. مونزور چەم، ئەمە لەدەرسیم روویدا، لەدەمی قوربانیەکانەوە، وەرگێڕانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، چاپی یەکەم ٢٠١٢، لا ١٤.

٥٧.م. رەسوڵ هاوار، کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دوهەمی جیهانی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤، لا ,٢٦٧

٥٨. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٥٩. چنار نامق، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,٣٣

٦٠. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٦١. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٢٥

٦٢. بیلال ن. شمشیر، بەڵگەنامەکانی ئینگلیز، لەبارەی کێشەی کوردی تورکیاوە، چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠٠٢، لاپەرە ,٤٨٤

٦٣.محەمەد عەلی سوڵتانی، بزووتنەوەی سەرهەڵدانی عەلەویەکانی زاگرۆس، بەرگی دووەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر ٢٠١١، لا ٢٣٧ ، ٢٣٨ ، ٢٣٩ .

٦٤. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٢٦

٦٥. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٢٥

٦٦. محەمەد رەئوف عەبدولعەزیز، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە٦١.

٦٧. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٦٨. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٦٩. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١٠٨

٧٠. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٧١. پرۆفیسۆر داڤید گاونت، سەرچاوەی پێشوو.

٧٢. چنار نامق، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,٣٧

٧٣. چنار نامق، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ,٣٩

٧٤. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١٤٤

٧٥. مێدل ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٣٣، ٤٣٤ .

٧٦. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١١٣

٧٧.میدڵ ئیست ووچ، سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٨ ، ٩.

٧٨. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١٢٢

٧٩. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,١٠٨

٨٠. عارف قوربانی، لە تۆپخانەوە بۆ عەرعەر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤ ، لاپەرە ٧٥–٧٦.

٨١. میدڵ ئیست وۆچ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٠٨.

٨٢. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٨٧

٨٣. مونزور چەم، سەرچاوەی پێشوو، لا ,٨٣

٨٤. عارف قوربانی ـ شایەد حاڵەکانی ئەنفال ، بەرگی یەکەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٢ ، لا ١٠٦ ، ١٠٩ .

٨٥. تیشکێك لەسەر نرکەو ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق، زنجیرە ١ ، لاپەرە ٦.

٨٦. تیشکێك لەسەر نرکەو ناڵەی بەناو ئەنفالەکان، هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٩.

# بەشی دووەم

## تەوەرەی سێیەم

یەکەم/ دۆخی ژنان لە پێش ئەنفالدا

دووەم/ دۆخی ژنان لە پرۆسەی ئەنفالدا

سێیەم/ فرۆشتني کچانی ئەنفال

چوارەم/ جوولاندنی کەیسی فرۆشتني کچانی ئەنفال

### یەکەم/ دۆخی ژنان لە پێش ئەنفالدا

زیان و کاریگەریەکانی پرۆسەی ئەنفال، تەنها بوارێك لە بوارەکان یاخود رەهەندێکی ژیانی هاوڵاتیانی کوردستانی نەگرتۆتەوە بەڵکو تەواوی رەهەندەکانی ژیانی لە کۆمەڵگەی کوردیدا گرتۆتەوە و ئەم پرۆسەیە وێڕای لەناوبردنی مرۆڤی کورد و سوتان و وێرانکردنی تەواوی گوندەکانی کوردستان و رەزوباخ و لەناوبردنی تەواوی زیندەوەرانی کوردستان، بەڵام ئەم پرۆسەیە کاریگەری گەورەی لەسەر دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و سایکۆلۆجی تاکەکانی کۆمەڵگە دروست کردووە بە جۆرێك، تا ئەمرۆش ئەو کاریگەریانە شوێنیان لەسەر جەستەی کۆمەڵگەی کوردیدا ماوە.

ئەم پرۆسەیە وێڕای کاریگەریە گەورەکانی لەسەر تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگە، بەڵام کاریگەری گەورە و مەترسیداری لەسەر ژنان دروست کرد بەوەی بەشێکی زۆری ژنان و کچان لە پرۆسەی ئەنفالدا بوونە قوربانی و رووبەڕووی دەیان فشاری سایکۆلۆجی و هەڕەشە و کوشتن بوونەوە و بەشێکیشیان لە دوای دەستگیرکردنی هاوسەرەکانیان ئەرکی سەرپەرشتیاری خێزانیان گرتە ئەستۆ لەناو دۆخێکی تەواو شێواوی کۆمەڵایەتی و خراپی ئابووریدا، هاوکات گۆڕانی کار و وەزیفەی ژنان بەو پێیەی لە لادێکاندا ئەرکی ژنان لە پاڵ پیاواندا کشتوکاڵ و مەڕداری و دانەوێڵە چاندن بووە بەڵام لە دوای ئەنفال و نیشتەجێبوون لە ئۆردوگا زۆرە ملێکاندا ئەو وەزیفەیە نەما و هیچ ئەرکێکیان نەبوو جگە لە چاوەروانی و خەفەت و فرمێسکڕشتن لە چوارچێوەی دیواری ماڵدا.

بۆیە ناکرێت قسە لەسەر دۆخی ژنان بکرێت لە پرۆسەی ئەنفالدا، دۆخی ژنان یاخود رۆڵی ژنان لە پێش پرۆسەی ئەنفال فەرامۆش بکرێت.

بارودۆخی کۆمەڵگەی کوردەواری بە تایبەتیش پێش پرۆسەی ئەنفال، کۆمەڵگەیەکی لادێنشینی کشتوکاڵی بوو، پابەندیش بووە بە کۆمەڵێك دابونەریت و

بنەمای تایبەتی خۆی کە جیاوازبووە لە کۆمەڵگەکانی دەوروبەری ، دیارە ئافرەتیش وەکو توێژێکی سەرەکی رۆڵوئەرکی خۆی لە بنیاتنانی کۆمەڵگەدا بینیوە و بونی خۆی لە گشت بوارەکانی ژیاندا پیشان داوە .

دیارە ژن وەك هەر تاکێکی کۆمەڵگە ئەندامێکە لە دامەزراوەی خێزانی، خێزانیش بنەمای سیستمی کۆمەڵایەتیە و کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر گواستنەوەی دابونەریتەکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، بەو پێیەی زۆرێك لە خێزانەکانی کوردستان لەسەر سیستمی باوکسالاری دەڕۆن و ئەم سیستمەش بە شێوەیەکی بەربلاو لە ناوچە لادێنشینەکان و لای بەشێك لە شارنشینەکانیش تاکو ئێستا برەوی هەیە، لەم جۆرە خێزانانەدا بە شێوەیەکی گشتی پیاو سەرۆك خێزانە.١

هەرچەندە کۆمەڵی کوردەواری پەیوەستن بە سیستمی باوکسالاریەوە کە ئەمەش پەیوەندی بە سیستمی خێڵایەتییەوە هەیە، ئەم سیستمە تاکو ئیستا توانیویەتی پارێزگاری لە مانەوەی خۆی بکات بە تایبەت لە لادێکاندا بەوەی کە باوك رۆڵی سەرەکی هەیە لە بڕیارە کۆمەڵایەتی و خێزانیەکان و .( ئەم سیستمەش وای کردووە لە رووی کۆمەڵایەتیەوە هەمیشە پیاوان خاوەنی دەسەڵات و بڕیارین و لێپرسراویش بن لە بەرامبەر ژنان ، هەر بۆیە زۆربەی کارە گرنگ و چارەنوسسازەکانی خێزان لە دەستی پیاواندا بووە و پیاوان بەو ئەرکە هەستاون ، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناکرێ نکوڵی لەوە بکرێ کە ژن پایەیەکی بەرچاوی هەبووە لە کۆمەڵگەی کوردیدا ، هەر لەناو خێزانەوە تاکو دەگاتە یەکە کۆمەڵایەتیەکانی تر ، هەروەها ژنان تا رادەیەك لە ژیانی رۆژانەیاندا سەربەست بوون ئەم سەربەستیەش لەشارەکانەوە بۆ لادێکان گۆڕاوە ) ٢

ئافرەتی کورد هەر لەسەرەتاوە ئافرەتێکی زەحمەتکێش بووە و گەلێ ئەرکی لەسەر شانە وەك ئەوەی دایکە، منداڵ بەخێوکەرە، کارکەرە لە نێو ماڵ و

دەرەوەدا، ئیشی کشتوکاڵ و بازرگانی و مێوانداری و مەڕومالات و گەلێ جار ئیشوکاری پیاوانیش دەکات.٣

سەرەڕای هەموو ئەو دابونەریت و گیروگرفتە کۆمەلآیەتیانەی کە بە سەر ئافرەتە گوندنشینەکاندا سەپێنراوە و زۆر جار بۆتە هۆی دواکەوتنی لە روی کۆمەلآیەتی و رۆشنبیری و رامیاریەوە ، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە ئافرەتی کورد شانبەشانی پیاوان بەشدار بوونە لە گشت بوارەکانی ژیاندا .

( ئافرەتی کورد بە حوکمی باری جوگرافی ناوچەکە و دابونەریتی خۆی هەمیشە شانبەشانی پیاوان لە بوارەکانی کارو گوزەران و ژیان بەڕێوەبردندا بەشداربونە و لە هەمان کاتیشدا رۆڵی جوامێرانە و بەرچاویان لە ئیدارەی کاروباری سیاسیدا نواندووە ).٤

سەرەڕای ئەوەی ژنان لەکۆمەڵگەی کوردیدا لە پاڵ کاری رۆژانە و ئیشوکاری ناوماڵ و ئاژەڵداری و کشتوکاڵ ، لە هەمانکاتدا بەخێوکەر و پەروەردەکەری منداڵانیش بووە ، ( ژنان لە کۆمەڵگەی لادێنشینی کوردیدا ، بەشداری پیاوانیان کردووە لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداریدا بەشێکی زۆری کارەکانی لادێ لە لایەن ژن و پیاوەوە پێکەوە کراون ، سەرباری ئەوەی ژن ماڵداریشی لەسەر بووە ). ٥

وێڕای هەمو ئەو ئەرکانەی کە لەسەر شانی ژنی کورد بووە ، ژنان توانیویانە رۆڵی گەورەیان هەبێت و لە قۆناغە جیاجیاکاندا دەسەلآتی سیاسیان گرتۆتە دەست و بەشداریان لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا هەبووە هەر وەك خانزادی میری سۆران و عادیلە خانم و حەبسەخانی نەقیب و چەندانی تر کە توانیویانە ئەسپی خۆیان تاو بدەن و رۆڵی سیاسیانەی خۆیان بگێڕن ( ئەوەتە حەبسەخانی نەقیب لە بیست وسییەکانی سەدەی بیستەمدا چەندین جار نامەی تایبەتی ناردووە بۆ بارەگای یەکێتی نەتەوەکان لە جنێف وتێیدا باسی ئەو جەوروستەمە زۆرەی کردووە کە بە سەر کورددا هاتوون ، هەروەها میناخانمی خێزانی پێشەوا قازی

محەمەدی نەمر لە رۆژگاری کۆماری مهاباتدا جێگای حەبسەخانی نەقیبی گرتبووەوە وا دیارە خەریکی دامەزراندنی یەکەمین رێکخراوی ئافرەتان بووە ). ٦

هەروەها ئەمین زەکی بەگ سەبارەت بە رۆڵی ژن لە کۆمەڵی کوردەواریدا دەڵێت ( لە مێژووی هۆز و تیرە کوردییەکاندا کۆمەڵێك ئافرەت هەبون کە توانیان رۆڵی بەرچاویان هەبێت و کاروباری خێڵ و هۆزەکانی خۆیان بەرێوەبەرن ، لەوانەش حەلیمەخان لە هەکاری و عادیلە خان لە هەڵەبجە و کوێخا نێرگز لە شوان ) ٧

لەگەڵ هەموو ئەو زەحمەت و ئیشوکارە زۆرەی لە ئەستۆی ژنان بووە بەڵام پێدەچێت دۆخی ژنانی کورد لە لادێکاندا لە دۆخی زۆرێك لە ژنانی وڵاتانی ناوچە باشتر بووبێت، زۆرێك لە رۆژهەڵاتناسەکان ئاماژە بە رۆڵی گرنگی ژنانی کورد دەکەن لە کاروباری رۆژانەی ئیداری و کۆمەڵایەتی، لەو بارەیەوە رۆژهەڵاتناس ئەدمۆنز دەڵێت: بارودۆخی ژنی کورد رەنگە زۆر باشتر بێت لە بارودۆخی ژنان لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا.... هەروەها مینۆرسکی لە کتێبەکەیدا ( کورد ، تورك ، عەرەب ) دەڵێت: ژنان بەشداری کۆبوونەوەکانیان دەکرد و بە ئازایانەوە، بەشداری پیاوانیان دەکرد لە گفتوگۆکاندا.... تەها هاشم عەقراویش لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی ژنی کورد نوسیویەتی: ژنان لە کۆمەڵگەی کوردیدا پشتگیریەکی گەورەیان لێ دەکرێت لەلایەن پیاوانەوە و لە زۆر باردا بە سەریاندا زاڵە. ٨

ژنان لە لادێکاندا پەیوەندی کۆمەڵایەتییان زیاتر بۆ دەرەخسێ لەگەڵ خەڵکانی تردا بەهۆی چونە دەرەوەیان لە ماڵ بۆ کاری رۆژانەیان ( کارکردن لە دەرەوەی خێزاندا بۆتە هۆی ئەوەی کە ژنان لە چوارچێوەی ماڵدا گۆشەگیر نەبن و بواری تێکەڵاوبونیان بۆ برەخسێت ، هەر بۆیە ژنانی جوتیار زیاتر کۆمەڵایەتی ترن لەچاو ژنانی تردا و، سەربەستی هاتوچۆ و سەردانیان هەبووە و بەشداری پرسە و شاییان کردووە ). ٩

سەبارەت بە شێوازی کاروپیشەی ژنان لە پێش پرۆسەی ئەنفال و دوای پرۆسەی ئەنفال ، کە گۆڕینی کاروپیشە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی ژنان هەبووە، بۆ خستنەڕووی کارو پێشەی ژنان چەند لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەك دەخەینەڕوو لەسەر کاروپیشەی ژنان، لە لێکۆڵینەوەی ( محەمەد ڕەئوف ، ئەنفال و ڕەهەندە سۆسیۆلۆجیەکانی )١٠

**بڕوانە خشتەی ژمارە ٤**

| سەرپەرشتیاری خێزانی | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| سەرپەرشتیاری خێزان پێش شالاَوەکە | | | سەرپەرشتیاری خێزان پاش شالاَوەکە | | |
| باوك | ١٦١ | ٨٨,٤٦ | باوك | ٤٨ | ٢٦,٣٧ |
| دایك | ١٥ | ٨,٢٦ | دایك | ١٢٠ | ٦٥,٩٣ |
| برا | ٥ | ٢,٧٤ | برا | ١٢ | ٦,٥٩ |
| خوشك | ١ | ٠,٥٤ | خوشك | ٢ | ١,٠١ |
| كۆ | ١٨٢ | ٪١٠٠ | كۆ | ١٨٢ | ١٠٠ |

لەم خشتەیەوە ڕوون دەبێتەوە کە لە پێش شالاَوەکانی ئەنفالدا سەرپەرشتیاری خێزانی ( ٨٨,٤٨ )ی نمونەکە لەژێر دەسەلاَتی باوکدا بووە ، بەرامبەر بە ڕێژەی ( ٨,٢٦ )ی کە لەژێر دەسەلاَتی دایکدا بووە، ئەمیش ئەوە نیشان دەدات کە لە ژیانی خێزانی کۆمەڵی کوردەواریدا باوك سەرپەرشتیاری خێزان بووە هەتا دەمرد ئینجا دایك دەبوو بە سەرپەرشتیار .

بەلاَم دوای شالاَوی ئەنفال ڕێژەی سەرپەرشتیاری خێزانی ( ٢٦,٣٧ )لەژێر دەسەلاَتی باوکدا بووە بەرامبەر بە ڕێژەی ( ٦٥,٩٣ ) لەژێر دەسەلاَتی دایکدا بووە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت سەرپەرشتیاری خێزانی لە پاش شاڵاوەکە گوێزراوەتەوە لە باوکەوە بۆ دایك ، ئەمیش ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی هەرە زۆری ئەو کەسانەی بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون ڕێژەی پیاوانن کە سەرپەرشتیاری خێزانن کە ئەمەش بۆشایی دەسەڵاتی خێزانی دروست کردووە لە دوای شاڵاوەکە کاریگەری زۆری لەسەر پەروەردەی خێزانی دروست کردووە .

سەبارەت بە پیشەی ژنان لە پێش ئەنفال و دوای ئەنفال، بەپێی لێکۆڵینەوەی (هێمن باقر و بەرهەم عومەر ، ئەنفالی سێ و کاریگەریە کۆمەڵایەتیەکانی لەسەر ژنی پاشماوەی ئەنفال )١١

**بڕوانە خشتەی ژمارە ٥**

**پیشەی ژنان پێش ئەنفال و دوای ئەنفال**

| پیشەکان | پێش ئەنفال | | دوای ئەنفال | |
|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | ڕێژە٪ | ژمارە | ڕێژە٪ |
| کاریماڵەوە | ٨١ | ٢٩,٨ | ٩٩ | ٥٥ |
| جوتیاریی | ٧٦ | ٢٧,٩ | ١٠ | ٥,٦ |
| ئاژەڵداریی | ٨٥ | ٣١,٣ | ١٥ | ٨,٣ |
| کرێکاریی | ٩ | ٣,٣ | ٢٥ | ١٣,٩ |
| کاری دەستیی | ٢١ | ٧,٧ | ١٦ | ٨,٩ |
| فەرمانبەریی | ****** | ****** | ١٥ | ٨,٣ |
| کۆی گشتی | ٢٧٢ | ١٠٠ | ١٨٠ | ١٠٠ |

بەپێی خشتەی ژمارە ٥ ژنانی ئەنفال لە پێش پرۆسەی ئەنفالدا ( ٢٧,٩٪ ) یان جوتیار بوونە بەڵام لە دوای پرۆسەی ئەنفال ئەو ڕێژەیە کەمبۆتەوە بۆ ( ٥,٦٪ ) واتا ڕێژەکە بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کردووە، هاوکات لە پێش پرۆسەی ئەنفال

ژنان ( ٣١,٣٪ ) کاری ئاژەڵداریان کردووە، بەڵام لە دوای پرۆسەی ئەنفال ئەو ڕێژەیە دابەزیوە بۆ ( ٨،٣٪ ).

سەبارەت بە فەرمانبەری لە پێش پرۆسەی ئەنفال هیچ یەك لە ژنان فەرمانبەری حکومی نەبوون، بەڵام لە دوای پرۆسەکە و نیشتەجێبوونیان لە ئۆردوگاکاندا (٨,٣٪ ) یان بونەتە فەرمانبەر.

لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ژنان پێش پرۆسەی ئەنفال و لە گوندەکاندا :

١- ئافرەتان لە کۆمەڵگەی کوردیدا وێڕای هەموو ئەو دابونەریت و کۆتوبەندانەیان بەشداری گرنگیان لە بنیاتنانی کۆمەڵگەدا هەبووە .

٢- سەرەڕای ئەرك و کاری رۆژانەی ژنان لە کۆمەڵگەی کوردیدا ، توانیویەتی بەشداری لە بەڕێوەبردنی وڵات و کاروباری سیاسیدا بکات .

٣- بە هۆی بەشدارییان لە پرسە و شایی و پەیوەنیە کۆمەڵایەتیەکاندا ژنان زیاتر کراوەتر و کۆمەڵایەتی بونە و خاوەنی جۆرێك لە سەربەستی خۆیان بوونە .

٤- هەرچەندە لە خێزاندا باوك سەرپەرشتیارە، بەڵام لە لادێکاندا ژنان بەشداری کاری کشتووکاڵی و ئاژەڵداری و زۆربەی کارەکان بە هاوکاری پیاوان پێکەوە دەکەن .١٢

## دووەم/ دۆخی ژنان لە پرۆسەی ئەنفالدا

### أ. دۆخی ژنان لەناو پرۆسەی ئەنفالدا

سوپای عێراق لە کاتی پرۆسەی ئەنفالدا هیچ جیاوازییەکی نەکردووە لە نێوان ژن و منداڵ و پیاواندا، ئەم هەنگاوەی سوپای عێراق لە بڕیارێکی عەلی حەسەن مەجید، رازگری نوسینگەی باکووری حیزبی بەعسەوە وەرگیراوە، کە بە بڕیاری ژمارە (٢٨ /٤٠٠٨ ) لە بەرواری ١٩٨٧/٦/٢٠ دەرچووە و لە خاڵی ( ٤ )ی بڕیارەکەدا هاتووە: سوپا پێویستە هەر کاتێك بێت بۆردوومان بکات و تۆپ و هەلیکۆپتەر و فڕۆکە بە کار بهێنێت، تاکو زۆرترین ژمارەی ئەو کەسانە لەناو ببات کە لە ناوچە قەدەغەکراوەکاندان... هاوکات لە خاڵی ( ٥ ) یشدا ئاماژە بەوە دەکات کە هەر کەسێك بەبێ جیاوازی لەو ناوچانە بگیرێت دوای لێکۆڵینەوە دەبێت بکوژرێت.

ئەم رووداوە بە تەواوی دەستی سوپا و هێزەکانی عێراقی واڵاکرد کە هیچ جیاوازیەك نەکەن لە نێوان پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنی و لە نێوان ژن و پیاودا، بەڵام ئەوەی لەو پرۆسەیەدا زۆرترین قوربانیدا ژنان بوو، بەوەی لە کاتی پرۆسەکە و لەناو زیندانەکانیشدا بە توندترین شێوە سزا دراون و دەستدرێژیان کراوەتە سەر، سەرەڕای پرۆسەی ئەنفال، بەردەوام لە پێش هێرشەکانی ئەنفالدا سوپای عێراق بە تۆپ و هێلیکۆپتەر هێرشی کردۆتەوە گوندەکان و دەستی نەپاراستووە لە گوندنشینەکان، هەر وەك ژنێکی گوندی زینانەی خوارو دەڵێت: هیچ چارەیەکمان نەمابوو لە ترسا بە رۆژ دەچووینە شاخوهەردەکان و لە نێو ئەو چەموشیوەدا خۆمان دەشاردەوە، بە شەویش دەگەڕاینەوە بۆ ئاوایی. ١٣

هەر وەك ئایشە كە ئافرەتێكی دووگیانی تەمەن ٢٠ ساڵ بوو لە دێی شێخ حەمید، ئاماژە بەوە دەكات لە كاتی هێرشی سوپای عێراق بوردوومان و تۆپ و تەیارە ئاواییەكەی خۆیانی جێهێشتووە و لەگەڵ خەلكەكەدا رووی كردۆتە شاخ و ئەشكەوتەكان و سێ رۆژ لەوێ ماوەتەوە و لە دووەم رۆژدا ئایشە منداڵی دەبێت و هیچ شتێكی پێ نابێت منداڵەكەی پێ بپێچێتەوە، منداڵەكە لە ئەشكەوتە دادەنێت و دێتە درەوە بۆ خواردن و جلوبەرگ بەڵام لە لایەن دەوریەیەكی جاشەوە دەستگیر دەكرێت. ١٤

هەر بۆیە لە كاتی پرۆسەی ئەنفالدا سوپا بە تەواوی بریارەكانی عەلی حەسەن مەجیدی جێبەجێ كردووە و یەك مامەڵەی كردووە لەگەڵ ژن و منداڵ و پیاواندا، هەر وەك حەبسە بەهادینی خەڵكی گوندی "لەكی قادر سەرهەنگ" و ئیستا دانیشتووی شۆڕشە دەڵێت ( پاش ئەوەی جەیشوجاش بە پاڵپشتی توپ و تەیارە و شۆفلێ هاتن دایان بە سەر دێكەماندا ، بەبێ جیاوازیكردن لە نێوان ژن و منداڵ و پێرو گەنج دا هەموومانیان كۆكردەوە و خستیانینیانە ناو ئیڤاوە و بۆ لیواكەی چەمچەماڵ ، لەوێشەوە بۆ تۆبزاوا كاتێ گەیشتین دەتگوت رۆژی حەشرە هێندەی خەڵك لێ بوو قیژەی ژن و منداڵ دەگەیشتە كەشكەلانی فەلەك )١٥

هاوكات لە كاتی شاڵاوی ئەنفالدا سەرباز و جاشەكان سوكایەتیان بە ژنان و كچان دەكرد و بەزۆر پارە و ئاڵتونیان لە دەست و گوێیان دەكردەوە و بۆ خۆیان دەبرد، ژنێكی گوندی زینانەی خواروی سەر بە قەزای كفری لە بارەی بارودۆخی ژنان لە شاڵاوەكانی ئەنفالدا دەڵێت: لە ملەسوورە عەسكەریە گرتینیان، هەرچی پارەوپول بوو لێیان سەندین و بردیان، بەزۆر بازنگیان لە قۆڵی كچەكان دادەماڵی و لەچكەكانی سەریان لا ئەدا و بە دوای گوارەی ئاڵتوندا دەگەڕان، پاشان خستیانینە

ناو زیلی عەسکەریەوە، لە هەر سەیارەکدا چوار سەرباز لە هەر سوچێکی زیلەکەدا حیمایە بوون، بە قافڵەیەکی درێژ رووەو قەڵای ( قۆرەتوو) بردینیان، تەماشامان کرد قورەتوو پڕ کراوە لە خەڵك، دوو شەو و ڕۆژ لەوێ هێشتیانینەوە، لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا بە تراکتۆر و زیلی عەسکەری بەردەوام خەڵکیان دەهێنا. ١٦

بەشی زۆری ئەو کەسانەی کە لە پرۆسەی ئەنفالدا دەستگیر دەکران ژن و منداڵان بوون چونکە بەشی زۆری پیاوان پێشمەرگەبوون یان لە دەرەوەی گوندەکان بوون بۆیە ژن و منداڵەکان لە گوندەکاندا دەمانەوە، هەر وەك بەپێی راپۆرتی دەستنووسی رۆژانە ژمارە ( ٨٢٨٠ )ی ٦ی مایسی ١٩٨٨ لە فەرماندەی فەیلەقی یەکەوە بۆ عەمەلیاتی سوپا، ئەوانەی ئەو رۆژە لە نزیك تەقتەق دەستگیر کراون، ( ٦٠ ) پیاو ، ( ١٢٩ ) ژن ، ( ٣٩٦ ) منداڵ . ١٧

هاوکات لە قۆناغی هەشتی ئەنفال لە بادینان کە دوای قۆناغی پرۆسەی ئەنفال بوو بە هەزاران ژن و منداڵ گیراون، بەپێی راپۆرتی سوپای عێراق سەرجەمی ئەوانەی دەستگیر کراون لەو قۆناغەدا ( ١٣٣٩٥ ) کەس بوونە لەو ژمارەیە ( ٦٩٦٤ ) کەسیان منداڵ بوونە بە رێژەی ( ٥٢٪ ) و ژنان ( ٣٣٦٨ ) کەس بوون بە رێژەی ( ٢٥٪ ) ، بەم شێوەیە: ١٨

| | |
|---|---|
| ئەو تێکدەرانەی خۆیان بەدەستەوە داوە | ٨٠٣ |
| ئەو تێکدەرانەی گیراون | ٧٧١ |
| پیاو | ١٤٨٩ |
| ئافرەت | ٣٣٨٦ |
| منداڵ | ٦٩٦٤ |
| سەرجەم | ١٣٣٩٥ |

**ب. دۆخی ژنان لەناو زیندانەکاندا**

لە دوای کۆتایی هاتنی هەر قۆناغێکی ئەنفال، ئەو هاوڵاتیانەی دەستگر دەکران لە لایەن یەکەکانی سوپا و جاشەوە، راستەوخۆ دەگوزارانەوە بۆ نزیکترین بنکەی سەربازیی بەشێکی زۆری ئەوانەی لە گەرمیان دەستگیر دەکران دەبران بۆ قەڵای قۆرەتوو کە بارەگای فیرقەی پیادەی ٢١ی سوپای عێراقی لێ بوو کە لە ساڵانی هەشتاکاندا دروست کراوە، بە وتەی شایەتحاڵێك : بە لای کەمەوە ١٠ هەزار کەس لەو قەلایەدا بەند کرابوون، هەموو ماندوو و برسی بوون و ترس دای گرتبوون، کەس نەیدەزانی چی روو دەدا ..... ئێمە لە بارەگای فیرقە ماوەی سێ رۆژ ماینەوە، رۆژانە تەنها یەك نانمان وەردەگرت .... بە وتەی تەیمور عەبدوڵا تەواوی خەڵکی گوندەکانی ناوچەی کەلار لەوێ بوون و هەرچی قاوش بوو پڕ بوو لە خەڵك، کە لەوانەیە ٥٠ قاوش بوبێت و هەر یەکەیان ١٠٠ – ١٥٠ کەسی دەگرت و خواردنێکی زۆر کەمیان پێ دەدایین.١٩

بەشێکی تری دەستگیرکراوانی ئەنفالی سێ و ئەنفالی چوار گوێزرانەوە بۆ لیوای چەمچەمال و لەوێ کۆکرانەوە و هەندێکیشیان بۆ تەقتەق بەشێوەی کاتی بەڵام دواتر هەموویان گوازرانەوە بۆ کەمپی سوپای میللی لە تۆپزاوا .

**بڕوانە وێنەی ژمارە ٩ کەمپی تۆپزاوا**



پاش گەیشتنی خەڵکەکە بە سەربازگەی تۆبزاوا کە مەڵبەندی سەرەکی کۆکردنەوەی ئەنفالەکان بوو بە تایبەتیش لە قادرکەرەم و لەیلان و چەمچەماڵ وتەقتەقەوە ، پاشان لە تۆبزاوا دەست کرا بە دابەشکردنی خەڵکەکە بەسەر چوار گروپدا هەر وەك بەسیرە عەلی لەدایك بووی ساڵی ١٩٦٤ کەرکوك دەڵێت ( لە ناونوسینەکەدا لە یەکتری جیاکراینەوە ، هەرچی پیاوی گەنج بوایە ئەیان خستە ریزێکەوە و ئەوەی پیربوایە بۆ ریزێکی تر و ژن و منداڵ پێکەوە و کچە عارەبەکانیشیان بۆ قاعەیەکی تر برد ) ٢٠

بە گەیشتنی ئەنفالکراوان بۆ تۆپزاوا پرۆسەی پۆلێنکردن و جیاکردنەوەیان دەستی پێکرد کە لێرەدا ژن و پیاو و کچ و دایك و منداڵ جیاکرانەوە و ئەو جیاکردنەوەیە لە نێو قیژە و هاواری دایك و کچ و منداڵ لە یەکتری ،کرا.

بەپێی نوسراوێکی نهێنی و شەخسی بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی بۆ بەڕێوەبەری ناونەبراوی ئاسایشی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٨ دوای دوو مانگ لە تەواوبوونی پرۆسەی ئەنفال، ئاماژە بەوە دەکات کە وا ( ٢٥٣٢ ) کەس و ( ١٨٦٩ ) خێزان کە سەرجەمیان ژمارەیان ( ٩٠٣٠ ) کەسە، لەوانەی لە عەمەلیاتی ئەنفالی قارەماندا گیراون، نێردراون بۆ کەمپی سوپای میللی لە پارێزگای تەئمیم ( کەرکوك ) بە واتایەکی تر تۆپزاوا. ٢١

هەر لەناو زیندانەکەشدا بە جۆرەها شێوە ئازاری جەستەیی و دەروونیان دەدان ، زۆربەی کات لە بەرچاوی ژنان تەعزیبی پیاوانیان ئەدا و هەروەها منداڵانیان لێ دادەبڕین هەر وەك (سەبریە عبدالکریم )ی دانیشتووی سمود دەڵێت ( بۆ زیاتر ئازاردانمان زۆربەی جار شەو دەهاتن هەرچی منداڵ بوو لێیان دەسەندین ، منداڵ هەبوو شیری دەخوارد ، هەبوو لە شیرینی خەودا بوو ، دەیانکرد بە پەلیدا و دەیانبرد ، قیژەوزریکەی منداڵ و هاواری دایکان ئاسمانی کاس دەکرد ، کوێر دەبوین ئەوەندە دەگریاین ... پاش چەند سەعاتێك بۆیان دەهێنانەوە ) ٢٢

سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لە ژنان دووگیان بوون مناڵەكانیان لەباردەچوو یاخود لەناو ئەو حەشاماتەدا منداڵیان دەبوو ، هەر وەك " فەیرۆز ئیسماعیل جەلال " دانیشتووی سمود دەڵێت ( لەناو ئەو هەموو دەردەسەری و ڕەزالەتیەی تۆپزاوادا بەو هەموو ژان و ناڕەحەتیەوە بە سكێك دوو منداڵم بوو .....! تۆ بیربكەرەوە ژنێك زەیستان بە دوومنداڵی ڕوتەوە و لەناو ئەو هەموو زوڵموزۆر و برسێتی و بەتبەختیەدا بەبێ كەلوپەل ئەبێت ژیان چۆن بێت .....! ئەمە سەرەڕای سوكایەتی كردن و ئازاردانی سەربازەكانیش لەولاوە بوەستێت ) ٢٣

تۆپزاوا شوێنێكی سەرەكی بوو بۆ كۆكردنەوەی تەواوی ئەنفالەكان تەنانەت هاوڵاتی بلە و دۆڵی ئاكۆیانیش هێنران بۆ ئەو كەمپە لە قۆتاغی ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت، هاوكات بەشێك لە ئەنفالكراوانی هەڵەبجەشی تیادا بووە، مامۆستا فەرەج كە تەمەنی ٣٩ ساڵ بووە دوای كیمیابارانی هەڵەبجە دەچێتە ئێران و دوای دوو مانگ دەگەڕێتەوە لەگەڵ ژن و منداڵەكانی لە خاڵی پشكینینی ڕانیە دەگیرێن و دوای لێكۆڵینەوە لە ئەمنی سلێمانی بە پاسێك كە ٢٥ كەسی هەڵەبجە و كەلاری تیادا بووە دەبرێن بۆ تۆپزاوا. ٢٤

دواتر دوای بردن و بێسەروشوێنكردنی پیاوە گەنجەكان و بەشێك لە ژن و منداڵەكان، هەندێك لە زیندانیەكان دە گوازنەوە بۆ كەمپی سوپای میللی لە تكریت و زۆربەشیان دەگوێزنەوە بۆ بەندیخانەی ئافرەتان لە دبس، كە ٤٥ كیلۆمەتر دەكەوێتە باكووری ڕۆژئاوای كەركوكەوە.

یەكێك لە گاردەكانی دبس بە بەندیەكی تازە گەیشتبووی گوتبوو گوایە كەمپەكە لە دوو بینا و كۆمەڵە خانویەك پێكهاتووە، ( ٧٠٠٠ ) بەندی كوردی تێدایە...... ئەو كۆمەڵە ئافرەت و منداڵە لە دبس ماوەی چوار بۆ پێنج مانگ ماونەتەوە، تاوەكو ڕژێمی عێراق دواسەركەوتنی بە سەر پێشمەرگەدا ڕاگەیاند و لێبوردنێكی گشتیی بۆ كورد دەركرد. ٢٥

لە زیندانی دبسدا ژنان ژیانێكی زۆر سەختیان هەبوو بە هۆی قەرەباڵغی و نەخۆشیەوە زۆربەی مناڵەكان گیانیان لە دەستدا ، هەر وەك ( گەوهەر عەلی) كە

ژنێکی تەمەن (٣٥)ساڵ و خەڵکی دوز بوو بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ( کاتێك لە تۆپزاوا جیایان کردینەوە بردیانین بۆ سەربازگەی دبس ، لەوێ خواردنمان نەبوو ژیانمان زۆر خراپ بوو ، وە سەربازەکان زوو زوو ئەهاتنە سەرمان و لێیان دەداین بە کێڤڵ بۆ چاوترساندنمان ، وە منداڵەکانمان زۆر دەترسان هەر بۆیە بەشێکی زۆریان لەترس و برسێتی و بە هۆی بڵاوبونەوەی نەخۆشییەوە دەمردن ، پاش ئەوەی لێبوردنەکە دەرچوو هەندێکمان بەربووین و هەندێکیشمان بێسەروشوێن کراین ) . ٢٦

بەشێکی تری ئەنفالکراوانی قۆناغی ٨ی ئەنفال کە ناوچەی بادینانی گرتەوە، رەوانەی قەڵا سەربازییەکەی دهۆك کران لای نزارکی ، ئەم قەڵایە بینایەکی کۆنکرێتی ئیجگار قەبە و زەبەلاحە و لە ساڵانی حەفتاکاندا لە سەر رەنگرێژی سۆڤیەت دروست کراوە و لەو ( ١٣٣٩٥ ) کەسەی کە لە ئەنفالی بادینان گیران زۆربەیان لە شوێنی دەستگیرکردنیانەوە بە ئیڤا راپێچی ئەو قەڵایە کران، سەربازەکان لەو زیندانەدا زۆر دڕندانە مامەڵەیان کردووە، بە جۆرێك شقارتەیان بە ریش و سمێڵی بەندیەکانەوە دەنا، ئێرەم کە ئافرەتێکی گەنجی خەڵکی گوێزی بوو لەسەر چیای گارە، بە بەرچاویەوە شوبراکەیان زۆر دڕندانە فەلاقە کردبوو، هەموو گیانیان خەڵتانی خوێن کردبوو، ئێرەم کەوتە پاڕانەوە لێیان( بۆ خاتری خوا ... بۆ خاتری پێغەمبەر ) بۆ ئەوەی رێگەی بدەن بچێت خوێن و زامەکانی بشوات، بەڵام سەربازەکان نەیان دەهێشت و جڕتێکیان بۆ لێ دەدا و وتیان ( ئێوە نە خواتان هەیە و نە پێغەمبەر ).٢٧

پاش چەند رۆژێك مانەوە لە قەڵا سەربازیەکەی دهۆك، ئەو زیندانیانە بە ئیڤا و ئۆتۆمبیلی سەربازی رەوانەی سەربازگەی سەلامیە کرد کە چەند میلێك لە باشووری موسڵەوە بووە، کە بینایەکی گەورەی یەك نهۆمی بووە، بەڵام دوودەستە قاوش بووە، هەر قاوشە و شوێنی ناوچەیەکی تیا بووە، بەڵام سەرجەمیان خەڵکی بادینان بوون و هیچ کەسێکی سۆرانی تیا نەبووە، لە رێگەدا ژنێکی دووگیان ژان دەیگرێت و داوا لە شوفێرەکە دەکەن بوەستێت بەڵام ئەو ناوەستێت و بەردەوام دەبێت،

بۆیە بەدەم ڕۆیشتنی ئۆتۆمبیلە پڕ لە عەشاماتەکە و هەڵبەز و دابەزەوە بە ڕیگادا ژنە منداڵەکەی بوو، منداڵ ماو ناویان نا هاوار ، هەر لەوێدا ا بەشێك لە پیاوەکان بە وەجبە و بەش بەش دەبرێن، هەروەك ژنێکی خەڵکی گولی دوای ڕزگاربوونی بە میدڵ ئیست وۆچی وت ، پیاوەکانم بینی چاویان دەبەستنەوە و دەیانکردنە ئۆتۆمبیلی سەبازیەوە ،ئەو ئۆتۆمبیلە سەربازیانەی کە تەنها کونێکیان لە دواوە هەبوو، هەر کە دوو ئۆتۆمبیل بار دەکران دەڕۆیشتن و دوانی تر دەهاتنە جێگەیان، ئەو ژنە شەش ڕۆژ ئەو حاڵەتەی بینیوە. ٢٨

ئەو بەشەش کە تەمەنیان لە نێوان ( ٥٠ ـ ٩٠)ساڵیدا بوو واتە پیروپەککەوتەکان بەرەو قەلآی بەجێماوی ( نوگرەسەلمان )لە باشووری عێراق نێردران ، پاش ئەوەی ئەم پیرانەیان بە ئۆتۆمبێل گوێزایەوە بۆ نوگرە سەلمان کە نزیکەی ( ١٥)کاتژمێر لە تۆپزاواوە دوورە ، لەم بەندیخانە چوڵەدا نزیکەی (٨)هەزار بەندی تێدا بوو کە لەژیانی دۆزەخیدا دەژیان هەر وەك ئەفسەرێك لە تۆپزاوا پێی وتبوون : ( کورد هەموو خائین و ناپاکن و خۆمان دەزانین بۆ کوێتان دەنێرین ، دەتان نێرین بۆ ئەو دۆزەخەی کە بە تایبەت بۆ کورد دروست کراوە ).٢٩

سەبارەت بەو ژیانە سەختەی نوگرەسەلمان ( حاجی عبداللە) ی تەمەن (٧٠)ساڵە بۆمان دەگێڕێتەوە : ( پاش ئەوەی لە تۆپزاوا سواری پاسیان کردین لە بەیانی زووەوە بە ڕێوە بووین نزیکەی ( ١٣ ـ ١٥) سەعات لە سەیارەدا بووین ، پاشان بردیانینە قەلآیەکی کۆنی بەجێماو سەیرمان کرد حەشاماتێکی لێ بوو ، کردیانینە قاعەی گەورەوە کە هەر یەکەیان نزیکەی(٢٠٠)کەسی تیا بوو ، ڕوژی سەمونێکیان دەدایێ ئەم زیندانە وەك دەیانگوت نزیکەی ( ٨)هەزار کەسی تێدا بوو ، لێرەدا خەڵکیی زۆری بێ توانا بوون ،برسێتی و نەخۆشی باڵی بە سەر زیندانەکەدا کێشابوو ، لە هەمووی ناخۆشتر ، ئەفسەرێکی ڕەشی لێ بوو ناوی ( حەجاج )بوو زۆر خراپ بوو لەگەڵمان زۆر ئازاری دەداین ، پاش چەند مانگێك بە هۆی برسێتی و نەخۆشیەوە نزیکەی (٣)هەزار کەسمان لێ مردن وە مردووەکانیشمان دەناشت لە چاڵی بچوکدا لەبەر ئەوەی توانامان نەبوو گۆڕیان بۆ

هەڵبکەنین ، تەنها بە لم دامان دەپۆشین بەڵام پاش ئێمە شەش حەوت سەگی زل دەهاتن لمەکەیان لا دەدا و مردووەکانیان دەخوارد).٣٠

لە زیندانی نوگرە سەلمان، ئەنفالکراوانی هەڵەبجەشی لێ بووە، عیرفان حەمە سدیق، کە خۆی و باوك و دایکی و خانەوادەکەی دوای کیمیابارنی هەڵەبجە دەچنە ئێران و بەڵام لە دوای گەڕانەوەیان لە ئێران سوپای عێراق بە ئیڤا و ئۆتۆمبیلی سەربازی لە سنوورەوە دەیانهێنێت بۆ ئەمنی سلێمانی دوای پێنج ڕۆژ مانەوە دەیانبەن بۆ بەغداد و لەوێشەوە راستەوخۆ بۆ نوگرە سەلمان، دواتر لە لێبوردنە گشتیەکەدا بەر دەبن، ٣١

( ئەم چاوپێکەوتنە لەناو زیندانی نوگرە سەلمان کراوە نوسەر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەنووس سەردانی نوگرە سەلمانیان کردوو لە ٢٠٠٣/٧/٢٢، چەند کارێکی رۆژنامەوانیان کرد... نوسەر )

بڕوانە وێنەی ژمارە ١٠ نوگرەسەلمان



له نوگره سه‌لمان زیندانیه‌کان به توندترین شێوه ئازار دراون به تایبه‌تیش له لایه‌ن حه‌جاج که گه‌نجێکی که‌چه‌ڵی زله‌ی سه‌ر به باره‌گای ئه‌منی به‌غداد بووه و به‌رپرسی زیندانی نوگره سه‌لمان بووه، عه‌بدولقادر عه‌بدولڵا عه‌سکه‌ری که له‌دوای لێبوردنه‌که له نوگره‌سه‌لمان ئازاد کراوه ئاماژه به‌وه ده‌کات: حه‌جاجم بینی تاقمێك ئافره‌تی گه‌نجی دابووه به‌ر شه‌ق و تێهه‌ڵدان و به سۆنده‌ی پلاستیکیش هاتبووه وێزه‌یان ئه‌م ئافره‌تانه تازه له دبسه‌وه گه‌یشتبوون.٣٢

هه‌روه‌ها سه‌باره‌ت به درِنده‌یی حه‌جاج باس له‌وه ده‌کرێت که ( حه‌جاج کاتێك ئافره‌تێکی حامیله‌ی ببینیایه به‌و سۆنده‌یه‌ی ده‌ستی له سکی ئه‌و ئافره‌ته‌ی ده‌دا و ده‌یگوت ئه‌مانه لاو و زۆڵه‌کوردن. ٣٣

شاهیدعه‌یانێك له به‌ندیخانه‌ی نوگره سه‌لماندا ده‌یگێرێته‌وه‌و ده‌ڵێت: له قرچه‌ی گه‌رمای هاویندا،رۆژانه یه‌ك دوو ئافره‌تیان ئه‌هێنلیه ده‌ره‌وه و به عامودی ناوحه‌وشه‌ی به‌ندیخانه‌که هه‌ر له به‌یانی تاکو نیوه‌ڕۆ ئه‌یان به‌ستنه‌وه، هه‌تا ئه‌بورانه‌وه و نه‌ده‌بوایه که‌سیش نزیکیان بکه‌وێته‌وه، شه‌وانیش که سه‌ربازه‌کان سه‌رخۆش ده‌بوون، به‌زۆری لوله‌ی چه‌ك و له‌ژێر هه‌ڕه‌شه‌دا گۆرانیان پێ ده‌گوتن و هه‌ڵپه‌رکێیان پێ ده‌کردن. ٣٤

ئه‌م پیرو‌په‌ککه‌وته و ژن و منداڵانه‌ی له نوگره‌سمان بوون، پاش لێبوردنه‌که‌ی ٦ ی ئه‌یلولی ١٩٨٨ ئازاد کران، لێبوردنی ٦ی ئه‌یلولی ١٩٨٨ به ژماره ( ٧٣٦ )ی ئه‌نجومه‌نی سه‌رکردایه‌تی شۆڕش دوای نیوه‌رۆکه‌ی رۆژی ٦ی ئه‌یلول له دوای نوێژی نیوه‌رۆ له رادیۆوه خوێندرایه‌وه، بڕیاره‌که ( لێبوردنێکی گشتی و فراوانی ) راگه‌یاند، تاقه‌که‌سیش که‌وا ئه‌م لێبوردنه نه‌یگرته‌وه( جه‌لال تاڵه‌بانی خائین بوو، .. چونکه چه‌ند جاره به ئه‌نقه‌ست قانون و نیزام پێشێل ده‌کات، ته‌نانه‌ت پاش ئه‌وه‌ی که چه‌ند هه‌ل و ده‌رفه‌تیشی پێ درا که به‌خۆیدا بچێته‌وه و خۆی چاك بکات) ٣٥

ج. زیندەبەچالکردنی ژنان

زۆرێك لەوانەی دەستگیرکران، بە شێوەیکی زۆر دڕندانە لە لایەن یەکەکانی سوپای عێراقەوە بە پلان و بەرنامەی ورد، لە کەمپەکانەوە بە ئۆتۆمبیلی جامداخراو برانە بیابانەکانی و لەوێدا زیندەبەچاڵ کران، هەر وەك (یوست هڵتەرمان) دەڵێت : (پاش ئەوەی ئەو خەڵکە لە گوندەکانی خۆیان دەستگیر کران بەرەو مەرکەزەکانی جەیشی شەعبی لەکەرکوك پەلکێش کران ، لەوێشەوە لە لایەن کەرتی تایبەتی ترەوە لەناو ماشێن و پاسی کیلۆنکراو و پەنجەرەڕەش کراودا بەرەو رۆژئاوای عێراق لەباکوورەوە بۆ باشووری بیابان دەگوێزرانەوە و لەوێشدا پیاوان و لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا ژنان و منداڵەکانیش رەمی دەکرێن دەکوژرێن و بە بلدۆزەر مردووچاڵیان دەکەن ، بە تەقدیری ئێمە نزیکەی (١٠٠) هەزار کەس لە پیاو و ژن و منداڵ کە زۆربەیان مەدەنی بوون بە شێوەیەکی سیستماتیکی دەکوژرێن ). ٣٦

وەك دەردەکەوێت ژمارەیەکی زۆری ئەم ژن و منداڵانەشیان لەبیابانەکانی دیوانیە و سەماوەدا زیندەبەچاڵکرد ، هەر وەك بەسەرهاتی ( تەیمور عبدالله )و دایکی و خۆشکەکانی کە زیندەبەچاڵیان کردن ، وە هەموو ئەو کاروانەی لەگەڵ تەیموردا زیندەبەچاڵ کرابوون ژن و منداڵ بوون .٣٧

لێرەوە دەردەکەوێت کە زیندەبەچاڵکردن تەنها پیاوە گەنجەکانی نەگرتەوە بەڵکو بەشێکیش لە ژن و منداڵ زیندەبەچاڵکران ، هەر وەك ( محەمەد عبدالکریم بەرزنجی) کە یەکێکە لە زیندانیە سیاسییەکان ، لەو زیندانەی ئەمی تیا بوو چەندین تاوانباری تیا بوو ، کە بەشدارییان لە زیندەبەچاڵ کردنی ئەنفالەکاندا کردووە ، یەکێك لەو تاوانبارانە بەم شێوەیە دەیگێڕایەوە :. ( من رۆژانە دەمبینی و بە پێش چاومدا بە ماشێنی گەورە ژن و منداڵ و پیر و گەنجیان ئەهێنا ، بە کۆمەڵ ریز دەکران و گوللەباران دەکران ، گریان و هاوار و ئاخوئۆف بەرز ئەبووەوە ، رۆژێکیان ماشێنێکی پڕ لە خەڵکیان هێنا بۆ شوێنی جێبەجێ کردنی تاوانەکە لە

کاتێکدا ویستیان دایانبەزێنن ، سەرجەمی خەڵکی ناو ماشێنەکە دانەبەزین و مانیان گرت ، هەر بۆیە لێپرسراوەکە فەرمانی دەرکرد ماشێنەکە ئاگر تێبەردەن ،بەڵێ ماشێنەکەیان بەو هەموو خەڵکە بێدەسەڵاتەوە ئاگر تێبەردا و هەموویان بە ماشێنەکەوە سوتاندن وە بە ماشێنەکەشەوە فڕێدرانە ناو چاڵەکەوە،ئەم کارانە لە سنوری پارێزگای ( رومادی ، سەماوە، دیوانیە)دا بوو.٣٨

بەپێی زۆرێك لە زانیارییەکان ئەم گەنجانە بەشی زۆریشان ئافرەتی گەنجیان لەگەڵدا بووە لە بیابانەکانی عەرعەر و رومادی و سەماوە زیندەبەچاڵ کراون ، زۆر بە دەگمەن لەو دۆزەخە رزگاریان بووە ، ئەو چەند کەسەشی کە رزگاریان بووە هەندێکیان گەڕاونەتەوە کوردستان و هەندێکیشان رویان لە وڵاتانی دراوسێ کردووە، بۆ ئەم مەبەستە " م. حاجی شەوکەت رەفعەت " مامۆستای مزگەوتی شوعلە لە خانەقین کە لە ساڵی ٢٠٠٢ دا سەفەری حەجی کردووە یەکێك لەکچە ئەنفالکراوەکانی بینیوە لە لای پیاوێکی عەرەب لە سعودیە ، مامۆستا حاجی شەوکەت دەڵێ : ( من لەکاتی حەجکردندا لە بازاڕی مەککەدا بووم ، پیاوێکی عەرەب کە زانی من کوردم وتی وەڵا منیش ژنەکەم کوردە ، ئەگەر حەزدەکەی ببینی با بچین بۆ شوقەکەمان ، چونکە ئەوانیش هاتبوون بۆ حەج شوقەیان گرتبوو لە مەککە بەڵام خۆیان خەڵکی (نەجد) بوون ،شارێکی سعودییە لە نزیك سنووری عێراق ، کاتێك چومە شوقەکە ئافرەتە کوردەکەم بینی تەمەنی لەنێوان ٣٠ ـ ٣٥ ساڵ دەبوو ئافرەتێکی ژیر و هێمن بوو بەڵام زۆر بە ترسەوە مامەڵەی دەکرد زۆر دەترسا چونکە هێشتا بەعس مابوو لە ئەمن و ئیستخبارات دەترسا ، هەر کە چەند وشەیەکی کوردی لە من بیست دەستی کردە گریانێکی بەکوڵ ، پاشان هەناسەیەکی هەڵمژی و وتی تۆ بۆنی کەسوکارمت لێ دێت ، بە ترسەوە

روداوەکەی گێڕایەوەو وتی : خەڵکی دێیەکی نزیکی (دەربەندی خانم ) لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا و لە شەوێکدا ئێمەیان لەگەڵ دەیان کوڕوکچی گەنجدا بردە بیابان و هەر لەوێدا گوێم لە دەنگی دەسترێژی گوللە و هاوار و قیژەی خەڵك بوو . ئێمەیان برد بەرە و چاڵێکی گەورە و گوللەبارانیان کردین ، بۆیە هەر لەوێدا بە چاوی خۆم دایکمم بینی کە بەرکەوت ، بەڵام من بەر نەکەوتم لەبەر تاریکی سەربازەکان منیان نەبینی لەو چاڵە پڕ لە خوێن و مەرگە دوورکەوتمەوە بە ترس و لەرزی زۆرەوە ،دوایی لەگەڵ ٢ کوڕ و ٢ کچی رزگار بوودا یەکمانگرت و بە درێژایی ئەو شەوە رێگەمان بڕی تا گەیشتینە ئاوەدانی و دێیەکی نزیك نەجدی سعودی ، لەوێ لە ماڵێکداماینەوە تا ماوەیەك ، تا ئەم پیاوە عەرەبەم بینی کە هاموشۆی گوندەکەی دەکرد و شوم پێ کرد یەکێك لە کوڕە رزگاربووەکان بووە (ولی امرم)، ماموستا حاجی شەوکەت دەڵێ هەرچەندە لە ترسا ناوی خۆی نەوت بەڵام وتی ناوم ئوم محەمەدە و سێ مناڵیشم لەم پیاوە هەیە ، هەرچەندە داوام لێ کرد بێتەوە کوردستان ، پیاوەکە وتی من مانعم نییە ، بەڵام ئەو وتی من١٤ ساڵە لەگەڵ ئەم پیاوە دەژیم و وە کەسم نەماوە دایکوباوکم و کەسووکارم هەمووی زیندەبەچاڵ کراون).٣٩

یەکێکی تر لەو بەڵگەنامانەی رژێم کە بە ئاشکرا ددان دەنێت بە لەناوبردنی ئەنفالەکاندا وەڵامی ئەو بەزەیینامەیە بوو کە ( عاصی مستەفا ئەحمەد )ی خەڵکی شاری چەمچەماڵ ئاراستەی سەرۆکی عێراقی کردبوو کە ئەم خۆی دیلی جەنگ بوو لە ئێران پاش گەڕانەوەی لە ٢٤ / ٨ / ١٩٩٠ دا بۆی دەرکەوت کە ژن و مناڵەکانی بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون بۆیە بەزەیینامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی عێڕاقی کردبوو ، ئەویش بەم جۆرە وەڵامی داوەتەوە :.

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

کۆماری عێراق

دیوانی سەرۆکایەتی

ژمارە . ش ع / ٤ / ١٦٥٦٥

رۆژ ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٠

بەڕێز / عاسی مستەفا ئەحمەد

پارێزگای سلێمانی / قەزای چەمچەماڵ / گەڕەکی بێکەس / مزگەوتی حاجی ئیبراهیم

ئاماژە بەبەزەیینامەکەت لە ٤ ی تشرینی یەکەمدا ، ژنەکەت و منداڵەکانت لە سەردەمی عەمەلیاتی ئەنفالدا کەوا لەساڵی ١٩٨٨ لە ناوچەی باکووردا ئەنجامدرا ون بون .

دڵسۆزتان

سەعدون علوان مصلح

سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار

( بڕوانە پاشکۆی ژمارە ٩ )

د. دەستدرێژی سەربازەکان

سەرەڕای لێدان و ئەشکەنجەدان و ترساندنی ژنان و کچانی ئەنفال لەناو زیندانیەکانی تۆپزاوا و دبس و نوگره سەلمان، بە پێی زۆرێك لە گێرانەوەکان، هەندێك لە کچان و ژنان ڕووبەڕووی دەستدرێژی بەزۆر بونەتەوە، ئەگەر ئەو دەستدرێژیانە لە لایەکەوە بەزۆر و بەوپەڕی ئازار و نەهامەتی بوو بێت ئەوا لە لایەکی تر گەورەترین کاریگەری لەسەر سایکۆلۆجی ئەو ژنانە دروست دەکات بەوەی لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەستدرێژیکردن بە یەکێك لە هەرە کارە قێزەوون و نەفرەت لێ کراوە کۆمەڵایەتیەکان دادەنرێت، هەر بۆیە تا ئەمڕۆش ئەو حاڵەتانەی کە لە لایەن هەندێك لە بەندیەکانەوە دەگێردریتەوە و بینیویانە، لە لایەن هیچ یەك لە قوربانیەکانەوە نەگێڕدراوەتەوە و ئاماژەی بۆ نەکراوە.

ڕێکخراوی میدڵ ئیست وۆچ لەو بڕوایەدایە، کە دەنگ و باسێکی زۆر ترسناك هەیە کەوا لە بارەی کۆمەڵێکی گەورەی کچە عازەبەوە دەدوێت ،گوایە بە جیا لە بەندیەکانی تر دایاننناون و بەردەوام ئەمنەکان دەستدرێژیان کردونەتە سەر، هەروەها باسی ئەوەش هەیە کە یەکێك لەم ئافرەتانە لە ئەنجامی ئەم کارەدا خۆی بە چەقۆیەك کوشتووە، دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتی بەندکراو لە عێراقدا لە هەموو شوێنێکی تر زیاتر بەڵگەی بە دەستەوەبووی هەیە و تەنانەت وا زانراوە کە لەسەر کاسێتی ڤیدیۆش تۆمار کرابێت. ٤٠

ئەو چەند ڕۆژەی کە لە تۆپزاوا بوون ژنان توشی دنیایەك لە مەینەتی و دەردەسەری و ئازاری جەستەیی و دەروونی بونەتەوە . تا دەگاتە سەردەستدریژی کردنە سەر ئافرەتان .( کاتێك پیاو و ئافرەتەکان لێك جیاکرانەوە ، جەلادەکان دەستدرێژییان کردۆتە سەر ناموسی ئافرەتەکان و تەعەدایان لێ کردوون ). ٤١

بە دوور لە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤایەتی سوکایەتیان بە کەرامەتی هاوڵاتیان کردووە ، زۆربەی شایەدحاڵەکان دەستدرێژی ناموسییان بینیوە ، "ڕەحمە

عبالکریم " دەڵێ ( بە چاوی خۆم لە سەربازگەی تۆپزاوا دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتانم بینیوە ، کچێکی زۆر جوان کە ناوی بەیان بوو خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی قەرە حەسەن بوو ، تەمەنی " ١٤ ـ ١٥ " ساڵ بوو عەسکەرەکان پەلاماریاندا ، هەر ئەو شەوە لە تاوا شێت بوو دوایی لە قاعەکان بە زنجیر دەیانبەستەوە بە پەنجەرەکانەوە ) . ٤٢

هەروەها ئافرەتێکی هەلأتووی عەرعەر دەلێت ( رۆژی وا هەبووە دوانزە پیاو هاتونەتە لام و دەستدریژیان کردۆتە سەر ناموسم ) . ٤٣

هاوکات لە زیندانی نوگرە سەلمانیش سەربازەکان دەستدرێژیان دەکردە سەر ئافرەتەکان، حاجی حەمە ئەمین، کە یەکێك بوو لە زیندانیەکانی نوگرەسەلمان ئاماژە بەوە دەکات کە جارێکیان چووم بۆ ژورەکەی حەجاج بۆ هەندێ کار، لە دەرگاکەوە بینیم ئافرەتی بردبووە ژوورەوە بۆیە بە تورەییەوە دەریکردمە دەرەوە. ٤٤

هاوکات زۆرێك لەو ژنانەی کە دەستدرێژیان کراوەتە سەر لەبەر دۆخی کۆمەڵایەتی ناتوانن راستەوخۆ ئەو پرسە باس بکەن، بەلام لە لای کەسانێك کە دڵنیابن لێیان ئەو پرسە باس دەکەن، رێکار مزووری، چالاکی بواری ئەنفال و جینۆساید، ( بە نووسەری ) راگەیاند: لە کاتی کۆکردنەوەی بەڵگە بۆ کەیسی ئەنفال لە دادگای باڵای تاوانەکان لە ساڵی ٢٠٠٦ — ٢٠٠٧ چاوپێکەوتننمان لەگەڵ ١٠ ژنی ئەنفالدا کردووە لە کۆمەڵگە زۆرەملێکان ( دیارە ناوی ژنەکان و شوێن و جێگەیان لای رێکار مزوری پارێزراوە ) خۆیان لەگەڵ پارێزەران و داکۆکیکارانی ئەو بوارە کۆبوونەتەوە و سەردانیان کردوون، باسی دەستدرێژیان کردووە لە زیندانی تۆپزاوا، تەنانەت کەسێکیان وێنەی ( ئەشیعەی ) ئەو سەردەمی پێ بوو کە حەوزی شکاوە، لە کاتی دەستدرێژی بەزۆری سەربازەکاندا حەوزی شکاوە و نەشتەرگەری بۆ کراوە، بەهۆی ئەو حاڵەتەوە.

## چوارەم/ فرۆشتنی کچانی ئەنفال

زۆرێك لە گێرانەوە و شایەدحاڵەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بەشێك لەو ژن و کچانەی ئەنفالکراون و بێسەروشوێن کراون، لە ناوخۆی عێراق و لە دەرەوەی عێراق فرۆشراون، هەرچەندە تا ئێستا هیچ یەك لەو کچانە نەهاتوونەتەوە هەرێمی کوردستان و ئەو دەنگۆیانە بسەلمێنن، بەڵام هەندێك پێیان وایە بەشێك لەو کچانەی کە لە ناوخۆی عێراقدا بە ئەفسەر و سەرۆك عەشیرەتەکان فرۆشراون، هاتوونەتەوە کوردستان بەڵام لەبەر سومعە و لایەنی کۆمەڵایەتی قسە ناکەن.

لەبەر ئەوەی تا ئێستاش ئامار و داتایەکی دروست، لە لایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانی حکومەتی هەرێمەوە لەسەر ژمارەی راستەقینەی ئەنفالکراوان لە بەردەستدا نیە، بە تایبەتیش کچانی ئەنفالکراو کە ئامانجی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە، بۆیە پەنا بۆ توێژینەوە ئەکادیمیەکان دەبەین، بە تایبەتیش ئەوانەی فۆرمی راپرسیان لەناو کەسوکاری ئەنفالکراواندا پرکردۆتەوە.

بەپێی لێکۆڵینەوەی ( ئەنفال ، کارەسات، ئەنجام و رەهەندەکانی ) لە نوسینی (یوسف دزەیی) کە وەك نامەی ماستەر پێشکەشی بەشی کۆمەڵناسی لە کۆلێجی ئادابی زانکۆی صەلاحەدین کردووە، کە ٣٩٤ کەیسی وەرگرتووە، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە رێژەی ئەنفالکراوان ( ٦٥,٥٪ ) یان لە رەگەزی نێرینەن و ( ٣٤,٥٪ ) لە رەگەزی مێینەن، ئەو رێژەیەی کە لە رەگەزی مێیینەن و تەمەنیان لە نێوان (١١ بۆ ٣٠ ) ساڵیدایە کچانن لە ( ٣٤,٥٪ ) ئەنفالکراوان پێك دێنن و بێسەروشوێنکراون، کە کۆی تەمەنەکانی تر کە ئەنفالکراون بە منداڵ و پیرو سەرو ٣٠ ساڵیەوە لە رەگەزی مێ لە ( ٦٥,٥٪) پێك دەهێنن. ئەو کەسانەی لە رەگەزی مێیینەن و ئەنفالکراون و نەگەڕاونەتەوە رێژەیەکی بەرچاوی ئەنفالکراوان پێك دەهێنن.٤٥

له ئەنجامی توێژینەیەوەیەکی زانستیدا بە ناوی ( ئەنفالی گەرمیان، رەهەندە دیموگرافی و ئابووری کۆمەڵایەتیەکانی ) لە نوسینی ( جاسم محەمەد عەلی ) کە پێشکەشی بەشی جوگرافی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی کردووە،کە ٣٢٧ کەیسی وەرگرتووە، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە رێژەی ئەنفالکراوان (٥٣,٥٪ ) یان لە رەگەزی نێرینەن و ( ٤٦,٥٪ ) لە رەگەزی مێینەن، ئەو رێژەیەی کە لە رەگەزی مێیینەن و تەمەنیان لە نێوان (١١ بۆ ٣٠ ) ساڵیدایە کچانن لە (٤٦٪) ئەنفالکراوانی پێك دێنن و بێسەروشوێن کراون، کە کۆی تەمەنەکانی تر کە ئەنفالکراون بە منداڵ و پیرو سەرو ٣٠ ساڵیەوە لە رەگەزی مێ لە ( ٥٤٪) پێك دەهێنن. ئەم لیکۆڵینەوەیە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە زۆرترین ئەو کەسانەی لە رەگەزی مێیینەن و ئەنفالکراون و نەگەڕاونەتەوە تەمەنیان لە نێوان ( ١١ بۆ ٣٠ ) ساڵیدایە.٤٦

بەڵام لە توێژینەوەی ( ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجیەکانی )ی (محەمەد رەئوف ) کە وەك لێکۆڵینەوەی دەرچوون پێشکەشی بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی سلێمانی کردووە لە ساڵی ٢٠٠٢، کە ١٨٢ کەیسی وەرگرتووە، دەرکەوتووە لە ((٦٠,٩٧٪)ی ئەنفالکراون لە رەگەزی نێرن و رێژەی (٣٩,٠٢٪)یان لە رەگەزی مێن، لە رەگەزی مێدا ( ٣٨,٣٥٪)یان لە تەمەنی ( ١١ بۆ ٣٠ ) ساڵیدان.٤٧

لە هەر سێ توێژینەوەکەدا دەرکەوتووە کە ئەو کچانەی ئەنفالکراون و تەمەنیان لە نێوان ( ١١ بۆ ٣٠ ) ساڵیدایە، زۆرترین ژمارەی ئەنفالکراوانی رەگەزی مێینە دەگرنەوە، ئەمەش ئەوە دەخاتەڕوو کە بەشی زۆری ئەوانەی ئەنفالکراون لە رەگەزی مێ ،کچان و ژنە گەنجەکانن ، کە یان زیندەبەچاڵکراون و یاخود فرۆشراون.

## أ‌- فرۆشتنی کچانی ئەنفال لە ناوخۆی عێراقدا

فرۆشتن و بردنی کچانی ئەنفال لە لایەن ئەفسەران و سەرۆك عەشیرەتەکان و سەرۆك جاشەکانەوە، هەروا بە ئاسانی و لەخۆوە نەبووە بەڵکو لە لایەن حیزبی بەعسەوە شەرعیەتی پێ دراوە، بەو پێیەی بەرپرسانی حیزبی بەعس بە نهێنی تەواوی ئەفسەر و فەرماندە سەربازیەکانیان ئاگادار کردۆتەوە لەوەی لە کاتی پرۆسەی ئەنفالدا هەر شتێکیان دەستکەوت بۆ خۆیان و ژنەکانیشیان بەپێی شەرع حەڵاڵە.

لە کۆبوونەوەیەکی ئەفسەرانی ئیستخباراتی سوپا لەگەڵ موستەشارەکان پێیان رادەگەیەنن کە میدڵ ست وۆچ لە زاری مستەشار محەمەد عەلی جاف گواستویەتیەوە، پێیان وتراوە: ئێوە هەر ماڵ و سامانێکی پێشمەرگە هەیە و لە شەڕدا دەستی بە سەردا دەگرن بۆخۆتانی ببەن، ژنەکانیشیان بەپێی شەرع و یاسا حەلاڵی ئێوەیە. ٤٨

ئەم قسەیەی بەرپرسانی ئیستخبارات، هەروا ساناو لەخۆوە نەبووە بەڵکو بڕیاری حیزبی بەعس بووە و دواتر ئەم بڕیارە لە پرۆسەی ئەنفالدا رەنگی داوەتەوە.

ئەگەرچی فرۆشتنی کچانی ئەنفال لە لایەن رژێمی بەعسەوە لێرەولەوێ دەبیسترا، بەڵام بۆ یەکەمجار ئەم پرسە لە لایەن بەرەی کوردستانیەوە بە ئاشکرا راگەیەنرا و لە راپۆرتی بەرەی کوردستانی کە لە شەش حیزب پێك هاتبوو لە ٢٤ \ ٢ \ ١٩٨٩ لە یاداشتێکدا، لیستێك لە قوربانییانی ئەنفالی گوندەکانی هەردوو پارێزگای کەرکوك و سلێمانی بۆ لیژنەی ماڤ مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکان ناردووە کە تەنها لە هەردوو مانگی ئادارو نیسانی ١٩٨٨ . زیانەکان بەو شێوەیە بووە:

١. ( ٧٢٨ ) گوندو شار و شارۆچکە وێرانکراون.

٢. ( ٤٠ هەزار ) خێزان راگوێزراون ( ١٦ هەزاریان ) لە زیندانەکانی رژێمدان.

٣. ( ٧٤٠٧ ) ژنی ناوچەکانی زەنگەنە و جەباری و سەنگاو لە زیندانی دوبز بەندکراون.

٤. ( ٥٦٠٠ ) ژنی ناوچە جیاجیاکان لە ناحیەی یایچی بەندکراون .

٥. ( ٤٥٦٠ ) منداڵ لەگەڵ ئافرەتاندا کە بە دەیانیان لێ مردوون و. منداڵانی تەمەن شەش مانگ تا یەك ساڵی، هەر یەکەی بە ٥٠ دینار فرۆشراون
٦. ( ٧٦٤٠ ) پیاو شوێنبزر کراون .
٧. سوکایەتی بە رەوشت و کەرامەتی ئافرەتان و ئازاردانیان، دوور لە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤایەتی. ٤٩
بەپێی سەرجەم گێڕانەوەکان و وتەی شایەدحاڵەکان، بەشێك لەو کچانەی تەمەنیان لە نێوان (١٢ بۆ ٢٥ ) ساڵیدایە بە تایبەتیش ئەوانەی کە جوان و بەرچاوی بوون دراونەتە ئەفسەر و شێخە عەرەبەکان و لە بەرامبەریشدا بڕێك پارەشیان پێ دراوە، هەر وەك هاولاتیەکی خەڵکی شاری سلێمانی دەیگێڕێتەوە ( نەیویست ناوی بڵاوبکرێتەوە) لە ساڵی ١٩٨٨ لە حیلە سەرباز بووە، رۆژێك یەکێك لە سەربازەکان دێت و پێیان دەڵێت: هەر کەسێك دەیەوێت کچی کورد بهێنێت، دەتوانێت داوای بکات و بۆی دێنن و ٥٠ دیناریشی دەدەنێ. ٥٠
فرۆشتنی کچانی ئەنفال لە نووسینی نووسەرە گەورەکانی عێراقیشدا باس کراوە، کەنعان مەکیە، نووسەری گەورەی عێراقی لە کتێبی ( القصوة وصمت )دا دەنوسێت : پێش ئەوەی سەردانی باکووری عێراق بکەم چەندین حیکایەتی سەیرم بیستبوو، بیستبووم ژنانی کورد لە بازاڕی کۆیلەفرۆشەکانی کەنداو دەفرۆشرێن.......ئاماژە بەوەشدەکات کە: شوفێرێکی کورد لە رێگای بەغد – عومان کاری کردووە، کاتێك ئۆتۆمبیلەکەی لە رێگای نزیك شاری رومادی پەکی دەکەوێت، دوو ئافرەتی کورد لێی نزیك بوونەتەوە و بە زمانی کوردی لەگەڵیدا دواون، لێ دەپاڕێنەوە بیانگەیەنێتە سلێمانی، پاش گفتوگۆ لە نێوان ئافرەتەکان و شوفێرەکە پێیان وتووە کە ئەوان لە کاتی شاڵاوەکانی ئەنفالی ١٩٩٨ دا دەستگیرکراون و ئەفسەرێکی بچوك لە سوپای عێراقی بە سەرۆك خێلێکی ناوچەی پارێزگای ئەنباری فرۆشتوون، بەڵام شوفێرەکە، داواکاری ئەو دوو ژنە رەت دەکاتەوە.٥١
لە لایەکی تریشەوە بەشی زۆری ئەو ئافرەتە گەنجانە درانە ئەفسەر و رەفیق حیزبی و سەرەك عەشرەتەکان و بەزۆر لێیان مارەکراون بەبێ گوێدانە هیچ یاسا و دابونەریتێك .( ئامینە حەمە ئەمین صالح، ١٢ ساڵ و لەدایك بوی ١٩٧٦ خەڵکی

گوندی گوپتەپەیە لە کیمیابارانەکەی گۆپتەپەدا دایکی و باوکی و چوار خوشك و دوو برای شەهید بوون ، خۆشی ئەنفال دەکرێت و رژێم دەیداتە یەکێك لە رەفیق حیزبییەکان و ١٠ هەزار دیناریشی بە خەلات دەداتێ ، ئێستا ئامینە خێزانی ئەو رەفیق حیزبییەیە و دانیشتووی شارۆچکەی " تەیمومەیە" لە پارێزگای بەسرە و چوار منالیشی هەیە ).٥٢.

هەروەها بەشێکی زۆری خەلکی شارەکانی بەغدا و باشووری عێراق ئاگاداری ژیان و چارەنوسی ئەو کچانەن کە دراون بە رەفیق حیزبییەکان . ئەوەتا سیروان ئەحمەد بەگ ، دانیشتووی شاری بەغدا لە گەرەکی رەشید دەلێت ( هاورێیەکم بەناوی ئەحمەد حاجی ئەمین ناسراو بە ئەبو ئازاد شوێنی زیاتر لە ٤٠ کچی کوردی ئەنفالکرا و پێ دەزانێت کە لە لایەن رژێمەوە دراون بە رەفیق حیزبییەکان ، هەروەها ئەبو ئازاد زانیاری تەواوی لەسەر شوێنی ئەو کچە کوردە ئەنفالکراوانە هەیە ). ٥٣

سەرەرای فرۆشتنی ئافرەتان بە ئەفسەر و رەفیق حیزبییەکان زۆر جار بەکۆمەل عەرەب چونەتە ناو زیندانیەکان و ئافرەتە جوانەکانیان هەلبژاردووە ، هەر وەك رەحمە عبدالکریم دەلێت :( دوو هەفتە بوو برابوینە دووبز ، رۆژێك کۆمەلێك سەیارەی جامرەش هاتن ، هەمووی عەرەبی دزداشەلەبەر بوون بەناو قاعەکەدا ئەگەران ، زابتی قاعەکەی ئێمە پیاوێکی باش بوو پێی ووتین هەرچی ژنی جوان و جەحێل هەیە لەچکەکانتان لە دەموچاوتانەوە بئالێنن ، ئەمانە هاتوون هەرچی جوان بێت و عەقلیان بیبرێت ئەیبەن بۆ خۆیان، کۆمەلێکیان جیا کردەوە و بردیانن).٥٤

هاوکات بەدریە جەلال، ئەوە دەگێرێتەوە کاتێك بەرەو تۆپزاوایان بردن لەگەل کچە تەمەن ١٨ سالەکەی و براو کەسوکارەکەی و مێردەکەی لە یەکتریان جیاکردنەوە، تەنها خۆی و کچە تەمەن ١٨ سالەکەی بەیەکەوە مانەوە تا دوو مانگ شەوانە هەر جارەی کۆمەلێك جل سەوز دەهاتن هەر یەکەیان کچێکیان لەگەل خۆیاندا دەبرد و نەیاندەهێنایەوە کاتێکیش پرسیارمان دەکرد دەیانوت بردوومانەتەوە بۆ لای

کەسوکارەکانیان لە شەوێکی دوای ئەو دوو مانگە هاتن و کچەکەی منیشیان بۆ هەتا هەتایە برد ئێستاش چاوەڕوانیم ڕۆژێك کچەکەم بگەڕێتەوە.٥٥

( ئەوەی جێگای قێزلێبوونەوەیە ڕژێم ئەنجامی دابێت ئەوەیە کە وێڕای سوکایەتی کردن بە ئافرەتان و ئازاردانیان ، ڕژێم کەوتە مامەڵە و سەودایەکی تر ، ئەویش فرۆشتنی ئافرەتان بوو، هەر وەك چەرخەکانی ناوەڕاست و کڕینوفرۆشتنی بەندە " عەبد" و گەڕانەوە بۆ سیستمی " عبودییەت " ) ٥٦

لە لایەکی تر ڕژێم تەنها بەوە نەوەستاوە و کەوتۆتە دابەشکردنی کچانی ئەنفال بە سەر مالانداو وەك کۆیلە دابەشی کردون، لە چاوپێکەوتنی نووسەر و مێژوونووس ( صدیق صالح ) لەگەڵ کەسێکدا بەناوی ( ڕەزا عەبدولرەحمان ) کە لە ساڵی ١٩٨٨ چەندین جار بۆ کڕینی کەلوپەلی دوکانداری لە سلێمانیەوە چۆتە بەغداد حاجیەکی عەرەب دەناسێت، کە نیوەرۆ دەچێتە ماڵی.و لەوێ حاجی باسی کچانی ئەنفال دەکات و دەڵێت: چەند ڕۆژێك لەمەوبەر، ڕێکخراوی حیزبی بەعسی گەڕەکەکەمان، بانگی کوڕەکەمیان کرد، کە چونە ئەوێ دەبینن ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی گەنجی کوردیان داناوە و خەریکن بە سەر ئەو ماڵانەدا بیانبەخشنەوە کە خۆیان مەبەستیانە و پێشتر دیاریان کردوون، بەزۆر دوان لەو کچانە دەدەن بەسەر کورەکەمداو، لەگەڵ خۆیدا هانیانیە ماڵەوە، ئێمە کە خێزلنێکی شیعە مەزهەبین، ئەمەیان بۆ چاودێریکردن و تاقیکردنەوەمان لەگەڵدا کردوون، چونکە دەزانن ئەم کارەمان بەلاوە ناڕەوا و نامرۆڤانەیە، کورەکانم کە ئەو دوو کچەیان هێنایەوە وتیان بابە ئێمە ئەو دووانە بە خۆشکی خۆمان دادەنێنین، تا بۆمان بکرێت ڕێز و شەرەفیان دەپارێزین، وە ناهێڵین لە گوڵێك کاڵتریان بەرامبەر بکرێت.

جا ئەوەبوو هێنامان دڵنەواییمان کردن و ب ەنەرمونیانی لەگەڵیاندا جووڵاینەوە، لە قاتی سەرەوەی خانووەکەماندا ژورێکمان بۆ تەرخان کردن، هەموو پێویستیەکی ژیانی ڕۆژانەمان بۆ دابین کردن، هەر لە جلوبەرگەوە تا خواردەمەنی و شتی تر، ئێستاکە حەز ئەکەم کە تۆ کوردی و جێی متمانەی منی بیان بینی و دڵیان بدەیتەوە، دڵنیایان بکەی کە ژیانیان پارێزراو دەبێ و سەلامەت و سەربەرز دەبن لە لامان، وا من دەچمە دەرێ و هەردووکیانت دەنێرمە لا، واقم وڕمابوو، نەمدەزانی

چی بلێم دەتگوت خەون دەبینم، تۆبلێی ئەمە راست بێ: هێندەم زانی دەرگای مۆدەکە کرایەوە و دوو کچە کوردی کزۆڵەی خەمگین، وەك دوو کۆترە کێویی باڵ کراو، هاتنە ژوورەوە، هەر کەمنیان بینی، بە سیماوڕواڵەتمدا زانییان کوردم، هەر دوو دایان لە پرمەی گریانێکی سەرگەردانانە و کرۆزانەوە و شیوەنێکی درێژخایەنیان کرد، کە بەردی دەکرد بە ئاو و داری دەهێنایە قسە، دەت وت بەسەر دوونیاوە نیم وەك برایەکی خوشك لێ بزربوو بە جۆش گریام، ئەمجا ئارام بوومەوە و کەوتمە قسەکردن لە تەکیاندا و دڵدانەوەیان، وتم ددان بە خۆتاندا بگرن، تازە قەوماوە و نابێت زۆر نارەحەتبن، باسی چاکی ماڵەکەیان کرد، وتیان : ئێمە خەڵکی گەرمیانین کاتێك هێزی ئەنفال گەڕان،پەلاماری ناوچەکەی داین، دایکمان و برایەکی بچووکمان دیوە کوژراون، نازانین باوك و براکانمان چییان لێ بە سەرهاتووە، دواجار کە ئێمەیان گرت و دووریان خستینەوە لەوێ لەتەك کۆمەڵێك ئافرەتی هاوتەمەنماندا جودایان کردینەوە و هێنایانینە ئێرە، یەك یەك و دووان بە سەر چەند ماڵێکی عەرەبدا دابەشیان کردین.

پرسیم کەس لە سلێمانی دەناسن، ئەوانیش ناونیشانی ئامۆزایەکی دوکانداریان دامێ گفتم دانێ کە زووزوو سەریان لێ بدەم، و دڵخۆشیم دانەوە کە خەمیان نەبێ و ئەو ئامۆزایەیان بۆ دەدۆزمەوە، دوای گەرانەوەم بۆ سلێمانی دووکانی ئامۆزاکەیانم دۆزیەوە، کە باسەکەم بۆ گێڕایەوە سەرەتا لە ترسا نکۆڵی لە ناسینیان دەکرد، بەڵام کە باسەکەم بۆ گێڕایەوە متمانەی پێ کردم، داوای کرد لەگەڵ خۆمدا بیبەمە لایان، لە سەفەری دواتردا ئەویشم برد، هەرسێکیان باوەشیان بەیەکتردا کردوو، دواتر لەگەڵ خۆماندا ئەوانمان هێنایەوە. بۆ سلێمانی.٥٧

بەپێی بەدواداچونێکی رۆژنامەی خەبات، لە ناوچەی شەترە و شەنافیە و دیوانیە ئافرەتی ئەنفالکراو هەیە کە بە سەرۆك عەشیرەتەکان فرۆشراون، لە ناوچەی شەترە ( شەترە قەزایەکە سەر بە پارێزگای زیقار ) چاویان بە چەند کەسێك کەوتووە کە گوتویانە ( ٤ — ٥ ) ئافرەت لەوێ هەن بە ئەسڵ کوردن و شوویان بە عەرەب کردووە، لە ماوەی ئەنفالدا هێناویانە گوتوویانە ئەم ئافرەتانە بەشوو دەدەین کێ مارەیان دەکات، ئێستا ئەوان لەوێن و منداڵیان هەیە، گەورەبوون،

پێان وتین ئێوه چیتان دەوێت لێیان، وتمان مادام ژنەکان کوردن ئەگەر پێیان خۆش بێت لەگەڵ هاوسەرەکانیان بمێننەوە ئەوا با بمیننەوە، ئەگەر پێیان خۆش نیە هەر شتێك بێتە کردن بۆیان دەکەین، هەتا ئەگەر پێکەوە بیانبەینەوە بۆ کوردستان، بۆیە پیاوەکانیان رێگەیان نەدا چاوپێکەوتن لەگەڵ ژنەکاندا بکەین بەڵکو تەنها خۆیان قسەیان بۆ کردین، هاوکات لە دیوانیەش لە دوای راگوێزانی هاوڵاتیانی کورد بۆ ئەو ناوچەیە ژمارەیەك لە ئافرەتەکانیان دراونەتە سەرۆك عەشیرەت و ئەفسەرەکان. ٥٨

**بڕوانە وێنەی ژمارە ١١**



لەگەڵ فرۆشتنی کچان و ژنانی ئەنفال، رژێم کەوتە فرۆشتن و سەوداکردن بە منداڵانی ئەنفال، بەپێی وتەی د. زەکیە ئیسماعیل کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە لە ٢٠٠٦ * بەپێی بەڵگەنامەیەك رژێمی عێراق ٢٠٠ منداڵی ئەنفالی داوەتە یەکێتی ئافرەتانی عێراق، بەپێی نوسراوێکی بەڕێوەبەرایەتی کەرکوکی موخابەراتی عێراقی کە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی موخابەراتی عێراقی لەوێشەوە بۆ رەفیقە مەنال یونس سەرۆکی یەکێتی گشتی ئافرەتانی عێراق نێردرابوو، باس لەوە دەکات کە لەگەڵ ئەو نوسراوەیاندا، وەجبەی یەکەمی

منداڵانی گیراو لە هەڵمەتەکانی ئەنفال لە باکووری عێراق بۆ یەکێتی گشتی ئافرەتانی عێراق دەنێرین( اتخاذ ماترونة مناسبا بحقهم – بۆ ئەنجامدانی ئەوەی بە پێویست دەزانن بەرامبەریان ) ، زەکیە ئیسماعیل ئاماژە بەوەش دەکات، لەو بەڵگەنامەیەدا باسی تەمەنی ئەو منداڵانە کراوە نەك ناوەکانیان ،کە تەمەنیان لە نێوان ٢ مانگ تا ٤ ساڵدا بووە، ژمارەی ئەو وەجبەیەی یەکەمیان زیاتر لە ٢٠٠ منداڵی کورد بووە، ئەو مندالانە بەپێی هەندێ زانیاری ئەوانە ئەو کات بردراونەتە ( القریه العراقیه ٩ کە لە ساڵی ١٩٨٠ دامەزرێندرا بوو، دەکەوێتە بەرەی کەرخ لە بەغدا، هەروەها هەندێ زانیاری باس لەوە دەکەن کە ئەو منداڵانە بەو حسابەی سەرۆك کۆمار باوکیانە بەناوی ئەوەوە تۆمار کراون، دواتر خراونەتە ناو سوپای مێردمنداڵانی سەدام و سوپای فیداییەکانی سەددام. ٥٩

*دکتۆرە زەکی ئیسماعیل حەقی، کوردی فەیلیە و لە بەغداد لەدایك بووە، دکتۆرای هەیە لە یاسای نێودەوڵەتیدا و لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە ئەمریکاوە دەگەرێتەوە عێراق و لە ئازاری ٢٠٠٤ دەبێتە راوێژکاری وەزارەتی دادی عێراق، لە ساڵی ٢٠٠٦ دەبێتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق. لە ساڵی ١٩٥٤ بۆتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان و لە شۆرشی ئەیلولدا دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی، هاوکات سکرتێری یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بووە لە ساڵی ١٩٧٠.

بەڵام بەپێی بەڵگەنامەیەکی ( القیاده العامه للقوات المسلحه ) فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراق ، کە لە ١٩٨٨/٤/٢٣ دا ئاراستەی فەیلەقی یەك کراوە، کە ئەوکات عەمید روکن عەدنان ناجی فەرماندەی بووە، فەرمان دەدات ئەو ( ٢٥٠) تێکدەر و بەکرێگراوەی کە دەستگیریان کردوون ( پیاوەکان ) بنێردرێنە فەرماندەیی فەیلەقی ( ٤ ) کە بنکەکەی لە عەمارەیە ، ئافرەتەکان بنێردرێنە فەرماندەی فەیلەقی ( ٣ ) کە بنکەکەی لە بەسرا بوو، منداڵەکانیش بنێردرێنە سەربازگەکانی مەشقی تانك و زرێپۆش لە تکریت. ٦٠

**بڕوانە پاشکۆی ژمارە ١٠**

ب- فرۆشتنی کچانی ئەنفال بە وڵاتانی دەرەوە

سەرەرای دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتان لەناو زیندانەکان و دواتریش فرۆشتنی بەشێك لە کچان و ئافرەتان، بەپێی زۆرێك لە بەڵگەنامەو گێڕانەوەی شایەتحاڵەکان، بەشێکی زۆری کچان و ئافرەتان فرۆشراون بە وڵاتانی ناوچەکە، چونکە بەشی زۆری ئەو کەسانەی ئەنفال کران و نەگەڕانەوە لە رەگەزی مێ ئەوانەن کە تەمەنیان لە نێوان ١٢ بۆ ٣٠ساڵیدایە، چونکە لە دوای بردنیان لە زیندانەکانی دبس و تۆپزاوا ئیتر نەبینرانەوە، هەر وەك ئەمین جەلال ئەمین لەدایك بووی ١٩٣٤ی گوندی هەیدەربەگی سەر بە ناحیەی ئاغجەلەر دەڵێت: کچە جوان و جاحێڵەکانیش کەس نەیدەزانی بۆکوێیان بردوون و چییان بە سەر هات، ئەوەندە ئەزانین تاوەکو تۆپزاوا هەمووومان پێکەوە بوین و لەوێ لە یەکتر جیاکراینەوە . ٦١

بەپێی زۆرێك لە بەڵگە و گێڕانەوەکان رژێمی بەعس، دەرگای بۆ میسریەکان کردۆتەوە کە ئەو کچانە ببەن بۆ خۆیان، لە دیارترین بەڵگەنامەش، بەڵگەنامەی فرۆشتنی ( ١٨) کچی ئەنفالە بە وڵاتی میسر ، بەپێی بەڵگەنامەی ژمارە ( ٦٠١ ) ساڵی ١٩٨٩ رژێم لەسەر داوای وڵاتی میسری عەرەبی ( ١٨ )کچی کوردی ئەنفال رەوانەی مەلهاکانی ئەو وڵاتە دەکات ، هەر وەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە :\

## به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

ژمارە / ١٦٠١
بەروار / ١٠ / ١٢ / ١٩٨٩

نهێنی و زۆر بەپەلە
بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری پارێزگای کەرکوك

بۆ / بەڕێوەبەرایەتی موخابەراتی گشتی

بابەت / جێبەجێ کردن

دوای ئاماژەی راستەوخۆ لە لایەن سەرکردایەتی سیاسییەوە ، هەڵساین بە ئەنجامدانی پرۆسەکانی ئەنفالی ( یەکەم و دووەم ) ، کە تیایدا کۆمەڵێکی جۆربەجۆرمان لە هاولاتیانی ئەو ناوچانە دەستگیرکرد ، لەگەڵ ژمارەیەکی بەرچاو لە کچان کە تەمەنیان لە نێوان ( ١٤ ـ ٢٩ ) ساڵیدان ، هەروەها بەپێی فەرمانەکانی ئێوەی بەڕێز ژمارەیەك لەو ئافرەتانەمان رەوانەی " مەلهاو یانە شەوییەکانی " ولاتی میسری عەرەبی کرد ، ئەویش لەسەر داوای خۆیان واتە " دەولەتی میسر " ، ئەمەش لیستی ناوی سەرجەم ئەو کچانەن لەگەڵ تەمەنەکانیان بفەرموون بۆ ئاگاداریتان لەگەڵ رێزدا :

| ناوەکان | تەمەن |
|---|---|
| گەلاوێژ عادل رەحیم | ١٧ |
| چیمەن نازم عەباس | ٢٣ |
| لەیلا عەباس جەوهەر | ٢١ |
| لەمیعە نازم عومەر | ١٩ |
| پەیمان شوکر مستەفا | ١٦ |
| خۆراسان عبدالله تۆفیق | ٢٠ |
| قەدرییە ئەحمەد ئیبراهیم | ١٧ |

| | |
|---|---|
| گولیلك ئیبراهیم عەلی | ١٩ |
| خەولە ئەحمەد فخرالدین | ٢٥ |
| عیسمەت قادر عەزیز | ٢٤ |
| نەجیبە حەسەن عەلی | ١٨ |
| حەسیبە ئەمین حەمزە | ٢٩ |
| شلێر حەسەن عەلی | ٢٠ |
| شوکریە رۆستەم محەمەد | ٢٧ |
| حەسیبە هیدایەت ئیبراهیم | ١٥ |
| کوێستان عەباس مولود | ٢٦ |
| سروە عوسمان کەریم | ١٧ |
| سۆزە مەجید بەسیم | ٢٩ |

ئیمزا

بەڕێوەبەری موخابەراتی پارێزگای کەرکوک

٢٠ / ١٢ / ١٩٨٩

( بڕوانە پاشکۆی ژمارە ١١ )

بڵاوبوونەوەی ئەم بەڵگەنامەیە زۆرترین کاردانەوەی بە دوای خۆیدا هێنا، بەوەی هەندێك بە دروستی دەزانن و هەندێکیش بە نادروستی دەزانن، چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی ئەو بەڵگەنامەیە بەم شێوەیەیە:

د. زەکی ئیسماعیل حەقی، کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بووە لە هاوپەیمانی شیعەکان لە ساڵی ٢٠٠٦، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو بۆ یەکەمینجار ئەو بەڵگەنامەیەی بڵاو کردۆتەوە، رایدەگەیەنێت: من راوێژکاری وەزارەتی داد بووم، نوسینگەکەم لە سەرەوەی نوسینگەی پۆڵ بریمەر حاکمی عێراق بوو، ژمارەیەك لاوی رۆژنامەنوس و کارمەندی دیکەی عێراق لەو کۆشکەدا دەمانەوە، شەوێك یەکێکیان پێی بەر وێنەیەك دەکەوێ و وێنەکە بەردەبێتەوە کە گەنجینە (خزنە) یەکی لە پشتدا دەبێ و هاوار دەکات ( ١٠٪ )ی بۆ منە و خۆم دۆزیمەوە، ئەو گەنجە وای دەزانی خەزێنەی پارەیە، ئەمریکیەکان هاتن وتیان کەس نابێ بیکاتەوە تاوەکو جەنەراڵ کامبلی قازی هێزەکانی ئەمریکا نەیەت.

د. زەکیە بەردەوام دەبێت و دەڵێت، کە جەنەراڵ کامبل هات و گەنجینەکە کرایەوە یەکسەر سەدان بەڵگەنامە بەدەرکەوتن و هەندێکیان کەوتنە سەر زەوی، لاوەکە دەگریا دەیگوت هیچم دەستنەکەوت، زۆر کاسێتی ڤیدیۆیی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی تێدا بوو، د. زەکیە ئەوە دەخاتە روو کە بەڵگەنامەی ئەو ١٨ کچە من لەوێ بینینم کە لە موخابەراتی کەرکوکەوە نێردراوە، هەروەها دەڵێ تەنها ١٨ کچ نین بەڵکو ٧٥ کچ دراونەتە وڵاتە عەرەبیەکان. ٦٢

سەرجەم ناوەکانی ناو بەڵگەنامەکە راستن و بونیان هەیە، بەشێك لە کەسوکارەکەیان لە دووزخورماتو وە بەشێکیشیان لە کفری نیشتەجێن، بەشارەت ئەمین هەمزە، کە برای حەسیبە ئەمین هەمزەیە لەگەڵ هەردوو کچەکەی نەجیبە حەسەن عەلی ١٥ ساڵ و شلێر حەسەن عەلی ١٢ساڵ کە ناویان لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، لەگەڵ حەسیبە هیدایەت ئیبراهیمی برازنی ، دەڵێ ( لە پاش ئەنفالکردنیان لە گوندی وارانیی خوارووەوە هێنایانە دوزو و لەوێوە بۆ تۆبزاوا وە پاشان بۆ دبسیان بردن ، ئێمە تا ئەوێ هەواڵیان ئەزانین ئەویش بە هۆی نیعمەت وارانی کەتا دبس لەگەڵیان بوو پاشان ئەو بەربوو ، ئێمە تا ئەمساڵ هەواڵیانمان نەئەزانی بەڵام کاتێك

زانیمان ناویان لەبەڵگەنامەکەدا هاتووە زۆرمان پێ خۆشبوو ، بەڵام کاتێك زانیمان ناردویانن بۆ میسر زۆر ناڕەحەت بووین چونکە ئەوان بەزۆر براوون، ئەوان زۆر بە رەوشت بوون، لەگەڵ ئەوەشدا خوادەکا ئەوان سوڕاغیان دەبێت و دێنەوە زۆر پێ خۆشحاڵ دەبین، خوشکەکەم حەسیبە خۆی و پیاوەکەیی و شەش کچی ئەنفالە ، بەڵام ناوی دوو کچیان لەبەڵگەنامەکەدا هاتووە، هەروەها براو برازنەکەشم ئەنفالە)٦٣

هەروەها مام هیدایەت ئیبراهیم و فەتحیەیە جەلالی دایکوباوکی حەسیبە هیدایەت ئیبراهیم کە ناوی لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە سەرەتا مام هیدایەت وتی ( ئێمە کاتێ زانیمان هەواڵی کچەکەمان هەیە زۆرمان پێ خۆش بوو بەڵام کە بۆمان دەرکەوت نێردراون بۆ میسر ، زۆر جەرگبڕ بوو چونکە کچەکەمان زۆر رەوشت بەرز بوو ... چی بکەین... حەمد بۆ ئەو خوا ..... وەلاَهی دەسەلاَتم هەبوایە پەنجا بەعسیم ئەکوشت ..... بەڵام ئاخ خ خ .. چی بکەم پیری و نەخۆشی )، هەروەها فەتحیەجەلالی دایکی دەڵێ : کچەکەم سێ ساڵ بوو شووی کردبوو منالّی نەبوو ، پیاوەکەشی ئەنفالە ئیتر نازانم ئەڵێن ناردویانە بۆ مەلها ، ئیمە ،هەرکات بێنەوە وەك نوری چاومان رێزیان لێ دەگرین ) ٦٤

لە لایەکی ترەوە نامق عبدالله تۆفیق کە برای خۆراسان عبدالله تۆفیقە و کچەکەی بە ناوی چیمەن نازم عەباس ناویان لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە ،دەڵێ : خوشکەکەم چوار منالّی هەبوو مێردەکەشی ئەنفالە ، بە راستی بە بیستنی هەواڵەکە لە لایەك زۆرمان پێ خوش بوو کەماون، لە لایەك مردنمان دەخواست، هەرچەندە شتەکە هیچ دەسەلاَتی ئەوانی تێدا نیە ، بەڵام ئەوەی لامان گرانە ئەوەیە کە کەس لە کاربەدەستان بە دەنگمانەوە نەهاتوون ، وەفدێکیان نە ناردووە بۆمیسر بۆ ئەوەی سوڕاغیان بزانین ) ٦٥

ئەم بەڵگەنامەیە زۆرترین لێکدانەوەی بۆ دەکرێت، زۆرێك پێیان وایە بەڵگەنامەیەکی ناڕاستە و زۆرێکیش پێیان وایە دروستە، هەندێکیش پێیان وایە بەڵگەنامەکە ناڕاستە بەڵام فرۆشتنی کچانی ئەنفال راستەیەکی حاشا هەڵنەگرە، لێرەدا شیکاریەکی ورد بۆ لایەنی راستی و ناڕاستی ئەو بەڵگەنامەیە دەکەین.

**یەکەم/ راستی بەڵگەنامەکە**

راستی و دروستی بەڵگەنامە پەیوەستە بە چەند خاڵێکەوە لەوانە:

١. ئەو کەسەی بەڵگەنامەکەی بڵاوکردۆتەوە، خۆی دکتۆرای لە یاسای نێودەوڵەتیدا هەیە و کوردی فەیلیە و یاساناسێکی نێودەوڵەتیە، هەروەها خۆی بەڵگەنامەکەی لە سندوقێکی ناو کۆشکەکانی سەدامدا دەست کەوتووە، واتا لە دەستی یەکەم بووە لە دەستی کەسی دووەم وەری نەگرتووە.

٢. ناوی تەواوی ئەو کچ و ژنانەی لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە راستن و هەموویان لە پرۆسەی ئەنفالدا، بەرکەوتوون و نەگەڕاونەتەوە.

٣. شوێنی بەڵگەنامەکە لە کەرکوکەوە نێردراوە بۆ بەڕێوەبەریتی ئاسایشی گشتی، واتا لەو پارێزگایەوە کە ئەو کچ و ژنانەی لێ گیراون و لەو زیندانەش (تۆپزاوا ) کە ئەوانی لێ زیندانی کراون.

٤. شایەتحاڵەکان خۆیان ئەو کچانەیان بینیوە کە لە لایەن میسرەکانەوە براون، " ئەڵماس پیر داود هەیاس " کاکەیی لەدایك بوی ١٩٣٩ ی شاری کەرکوکە دەڵێت ( من لەساڵی ١٩٨٨ کریکاربووم لە باخچەی " مەقەڕی قیادەی جەیشی شەعبی لیوای کەرکوك " بەیانیەك کارم دەکرد لە حەدیقەکەدا سێ میسری لە بەصرەوە هاتبوون ،هاتن بۆ لای " سەردار " زابت تەوجیهی سیاسی ، وتیان هاتوین بۆ ژنی کورد ، ئەویش زانیاری نەبوو لەسەر شتی وا بۆیە حەبسی کردن ، بەیانی "قایدی جەیشی شوعبە " ناتق هات سەردار پێی وت : ئەوانە هاتوون بۆ ژنی کورد، تو هیچ زانیاریەکت هەیە لەسەریان، ناتقیش وتی من هیچ مەعلوماتێکم نیە بۆیە دەچم بۆ ( فەرع ) واتا فەرعی کەرکوکی حیزبی بەعس، نا تق چوو پاش نیوسەعات گەڕایەوە، بە سەرداری وت ئەو سێ میسریە بێنن ،بەڵێ شتی وا هەیە، لەگەڵ خۆیدا سواری کردن چون بۆ مەعەسکەری تۆپزاوا، کە هاتنەوە مەقەڕی قیادە سێ ئافرەتیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بە چاوی خۆم هەرسێ ئافرەتەکانم بینی ، تەمەنیان لەنێوان " ١٨ - ٢٠ "ساڵ دەبوون و جلوبەرگی کوردییان لەبەردا بوو، دواتر ئافرەتەکانیان برد و رۆیشتن ) ٦٦

٥.	بەڵگەیەکی تری فرۆشتنی کچانی ئەنفال بە وڵاتی میسر، فرۆکەوانێکی میسریە کە خۆی کچە ئەنفالەکانی بینیوە لە میسر، کە لە لایەن مستەفای حەسەنە گەورە، چالاکی بواری ئەنفالەوە قسەی لەگەڵ کراوە و ئاوا دەیگێڕێتەوە:

لە فڕۆکەخانەی برۆکسل بە ڕێکەوت ژنێکی مەغریبیم ناسی کە دوو منالی جوانکیلەی پێ بوو، دوای ئەوە وتم کوردم و لەڕێکخراوی چاك کار دەکەم لەسەر دۆسیەی ئەنفال و هەڵەبجە، یەکسەر پێی ووتم ئێوەی مێردەکەم فڕۆکەوانێکی میسریە و زۆر جار باسی بیرەوەریەکانی خۆیم بۆ دەکات ، یەکێك لەو چیرۆکانەی باسی هاتنی کۆمەڵێك کچی کورد بوو لە ساڵی ١٩٨٨ بۆ فرۆکەخانەی قاهیرە، وتم بەڵکو قسە لەگەڵ مێردەکەت بکەم و سۆراغێکیان بکەین، وتی بە سەر چاو هەر کە گەڕامەوە قسەی لەگەڵ بکە ئەوەش ژمارە تەلەفۆنی ماڵمانە.

دوای حەفتەیەك تەلەفۆنم بۆیان کرد، مێردی ژنەکە کە فرۆکەوانێکی خانەنشینکراوە ناوی حیکمەت بوو زۆر میهرەبان بوو وتی هەرچیەك بە من بکرێت بۆتی دەکەم، وە وتی من بە چاوی خۆم دەیان کچی کوردم بینیوە هەندێکیان هەر لە فڕۆکەخانە ئەفسەر و فرۆکەوانەکان بۆ خۆیان بردیانن، وتم دێم بۆ لات بەڵکو یەکێکیان بدۆزینەوە، وتی زۆر چاکە من وەزیری ناوخۆ برادەری کۆنمە دەچین داوا لەو دەکەین، لە بەختی ڕەشی ئێمە هێندەی نەبرد ئەو فرۆکەوانە نەخۆشکەوت و ماڵئاوایی لە ژیان کرد، فریای ئەوە نەکەوت سۆراغێکمان بۆ بکات، بەڵام لەمیانەی ئەو چەند جارەی بە تەلفۆن قسەمان کرد، زۆر ڕاشکاوانە دەیوت ئەو خۆی بینیونی و ئەو کچانەی کە زۆر جوان بوون ، ئەفسەرەکان بۆ خۆیان بردیانن.٦٧

بۆیە ئەو بەڵگەنامەیە، چۆن ئەو ناوانەی دەست کەوتووە، بۆچی ناوی کەسی تری تیا نیە کە چەندین ژن و کچی تر لەگەڵیاندا گیراون، ئەو بەڵگەنامەیە بۆچی لە سندوقێکی ماڵی سەدامدا بووە و بە نهێنی هەڵگیراوە، هەموو ئەو شایەتحاڵانەی کە میسرییان بینیوە و هاتوون داوای کچی کوردیان کردووە، ئاماژەن بۆ دروستی بەڵگەنامەکە و فرۆشتنی کچی ئەنفال بە وڵاتی میسر و ولاتانی تری عەرەبی.

## دووەم/ نادروستی بەڵگەنامەکە

هەموو بەڵگە و گێڕانەوەکان ئاماژەن بە فرۆشتنی کچان و ژنانی ئەنفال بە وڵاتانی ناوچەکە بەڵام بەڵگەنامەی فرۆشتنی ( ١٨ ) کچی ئەنفال بە شێوەیەکی رەسمی فرۆشرابن بە وڵاتی میسری، ئەگەر بە وردی بە دواداچوون بۆ ئەو پرسە بکرێت و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ ئەو بەڵگەنامەیە بکرێت، چەند خاڵێکی نادروستی تێدا بەدی دەکرێت لەوانە:

١- بەڵگەنامەکە تەنها کۆپیەکەی بڵاوبۆتەوە و وێنە ئەسڵیەکەی تا ئێستا نەبینراوە، چونکە لە ناوەندە یاساییەکاندا کاری پێناکرێت.

٢- بەرواری بەڵگەنامەکە، مانگی ١٢ی ١٩٨٩ یە و تا زیاتر لە ساڵێك و ٨ مانگ بەسەر قۆناغی سێیەمی پرۆسەی ئەنفالدا تێپەڕیوە، کە ئەو کچانەی تیادا ئەنفالکراوە، بۆیە سەرجەم ئاماژە و بەڵگەکان ئەوە دەخەنە روو کە لەدوای کۆکردنەوەیان لە تۆپزاوا و پۆلێنکردنی ئەنفالەکان دوای چەند مانگێکی کەم ئەوانەی لەناوبران و سەرنگومکران، لەو ماوەیەدا واتا لە نێوان مانگی ( ٤ بۆ ١٩٨٨/٩) سەرجەم پرۆسەی زیندەبەچاڵ و سەرنگومکردن و ئازادکردنی بەشێکیان کۆتایی هات، چونکە قۆناغی سێی ئەنفال لە ٧ بۆ ٢٠ی نیسانی ١٩٨٨ی خایاندوو دواتر سەرجەم ئەوانەی گیران رەوانەی تۆپزاوا کران، بەڵام بەپێی گێڕانەوەکەی ( عوزێر ، عومەر ، ئیبراهیم ) کە لە گوللە بارانکردنەکانی زیندەبەچاڵکردن رزگاریان بوو، ئاماژە بەوە دەکەن لە ١٥ و ١٧ی نیساندا پرۆسەی زیندەبەچاڵ کردنیان کراوە، واتا دوای دەستگیر کردنیان و یەك دوو رۆژێك مانەوەیان لە تۆپزاوا یەکسەر بۆ زیندەبەچاڵ براون.٦٨

٣- له بەڵگەنامەکەدا ئاماژە بەو کچانە دەکات و دەڵێت کۆمەڵێك کچی ئەنفال کە تەمەنیان لە نێوان ( ١٤ بۆ ٢٩ ) ساڵیدایە بەڵام هیچ یەکێك لە کچەکان کە تەمەنەکانیان بەرامبەر ناوەکانیان نوسراوە لە بەڵگەنامەکەدا ١٤ ساڵ نیە، لە ١٥ ساڵ بەرەو ژوورە.

٤- بەڵگەنامەکە باس لە کۆمەڵێك کچ ( فتیات) دەکات، بەڵام زۆربەیان ژنن، بۆ نمونە( حەسیبە ئەمین هەمزە، هەردوو کچەکەشی لەگەڵ خۆیدایە، بە ناوەکانی نەجیبە حەسەن عەلی و شلێر حەسەن عەلی)، هاوکات ( خۆراسان عەبدوڵا ، کچەکەشی لەگەڵی دایە بەناوی چیمەن نازام)

٥- بەڵگەنامەکە دەڵێت ئەو کچانە لە پرۆسەی ئەنفالی یەك و دوو دەستگیر کراون، بەڵام ئەوان سەرجەمیان لە قۆناغی سێیەمی ئەنفال دەستگیر کراون. ٦٩

٦- لە رووی یاساییەوە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق ئەو بەڵگەنامەیەی بە نایاسایی لە قەڵەمدا و رەتیکردەوە، لە دانیشتنی دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق لەسەر کەیسی ئەنفال کە ( ٢٠٠٦/٨/٢١ تا ٢٠٠٧/٦/٢٤ ) بەڕێوەچوو، لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا ئەو بەڵگەنامەیە دەخرێتە بەردەم ، دادوەر محەمەد عرێبی، دادوەری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق لە کەیسی ئەنفال، بەڵام دوای خوێندنەوەی دەقی بەڵگەنامەکە لەناو هۆڵی دادگا دادوەر رەتی کردەوە و رایگەیاند، ئەو بەڵگەنامەیە هیچ بنەمایەکی یاسایی نیە و تەنها وەرەقەیەکی کۆپیە، لەناو هۆڵی دادگاکەدا تۆمەتبار ( صابر دووری، کە لە سەردەمی ئەنفالدا بەڕیوەبەری هەواڵگری سەربازی عێراق بووە ) قسەی لەسەر بەڵگەنامەکە کردووە و وتویەتی: ئەو بەڵگەنامەیە سیاقی نوسینەکەی هەڵەیە، چونکە ناکرێت دەزگای هەواڵگری ناوخۆی پارێزگایەك

مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتێکدا بکات،ئاماژەی بەوەشکردووە کە قەت عێراق ئەوەندە ئاستی نزم نەبووە بەوشێوەیە کتاب بنوسێت، هاوکات ئەیاد کاکەیی پارێزەری دەستەی داکۆکیکار لە کەیسی ئەنفال رایدەگەیەنێت، ئەو بەڵگەنامەیە لە رووی یاساییەوە تەواو نیە و نایاساییە و دادگا رەتی دەکاتەوە، بەوەی هەم بەڵگەنامەکە جگە لە وەرەقەیەکی کۆپیکرا و هیچ شتێك نیە و سیاقی نوسینەکەشی هەڵەیە چونکە مامەڵەی دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتێکی تر لە رێگەی باڵیۆزی و پەیوەندیە رەسمیەکانیەوە دەبێت نەك دەزگای هەواڵگری. ٧٠

٧- هەریەك لە جەلال تاڵەبانی سەرۆك کۆماری عێراق و مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، بەڵگەنامەکە بە ساختە لەقەڵەم دەدەن، ئەحمەد مەجید، کە هاووڵاتییەکی ناوچەی گەرمیانە دەڵێت چوار لەو کچانە ئامۆزای ئەون، ناوبراو بەرپرسی نوسینگەی کوردۆسایدە لە گەرمیان رایدەگەیەنێت، ئەو چوار کچەی کە خزمی منن خەڵکی ناوچەی نەوجولن ئەوکات دانیشتووی نەوجول و حەیدەرە سوور بوون، کە بریتین لە گەلاوێژ عادل ١٥ساڵ، چیمەن نازم ١٤ ساڵ، لەیلا عەباس ٣٠ ساڵ، عیسمەت قادر ٤٠ ساڵ".

ئەحمەد مەجید، ئاماژە بەوەش دەکات، چوار ساڵ لەمەوبەر لە قەزای دوکان چاویان بە تاڵەبانی کەوتووە و داوایان لێ کردووە لە بارەی چارەنووسی ئەو هەژدە کچەوە قسە لەگەڵ حکومەتی میسر بکات، بەڵام مام جەلال گوتی بەڵگەنامەکە ساختەیە، هاوکات مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، پێیان رادەگەیەنێت کە ئەو بەڵگەنامەیە دروست نیە و ساختەیە.٧١

## سێیەم/ بەدواداچوونی کچە فرۆشراوەکان

تا ئێستا چەندین کەس و لایەن بە شێوەی نارەسمی لە ولاتی میسر بەدواداچوونی بۆ پرسی ئەو ١٨ کچەی ئەنفال کردووە، کە لە بەڵگەنامەکەدا ناویان هاتووە، لە چەند کاتێکی دیاری کراو، لە ساڵی ٢٠٠٦ تا ٢٠٠٨، بەدواداچوون کراوە، من لێرە تێروانینی یەکێك لەو کەسانە دەخەمە ڕوو کە راسپێردراوە و بە وردی بەدواداچوونی بۆ ئەو کەیسە کردووە و چەندین نادی کلاَپ گەڕاوە. ئەو کەسە بە هۆی هەستیاری کۆمەلایەتی بابەتەکەوە نەیویست ناوی بلاوبکرێتەوە، ئامازەی بەوە کرد، سەرەتا لە ساڵی ٢٠٠٧ ، چۆتە ( شارع الهرم ) کە سەرجەمی نادی شەوانەیە، تەواوی ئەو نادیە شەوانییانە گەڕاوە، بە وردی هەواڵی پرسیوە بەلاَم سەرجەمیان رەتیانکردۆتەوە کچی کورد لەو نادیانە بووبن، هەرچەندە ئەم نائومێد دەبێت، بەلاَم لە ساڵی داهاتوو بە هۆی پەرۆشی بۆ پرسەکە بەدواداچوونەکانی بەردەوام دەبێت لە ٢٠٠٨دا دەچێتە ( رۆیاڵ کینگ) کە نادیەکی شەوانەی بەناوبانگە ،بە وردی لەگەڵ بەڕێوەبەری کارگێڕی ئەو نادیەدا قسە دەکات بەناوی ( امجد ) کە زیاتر لە ١٥ ساڵ بووە بەڕێوەبەری کارگێڕی ئەو نادیە شەوانەیەیە و دەیان نادی تر بووە، ئەم بە شێوەیەك قسەی کردووە کە سەرە داوی دەست کەوێت، پێی وتووە: من هاتووم بۆ رابواردن بۆ ئێرە بەلاَم حەزم لە ئافرەتی میسری نیە، ئەڵێن هەندێك ئافرەتی کورد هەن زۆر جوانن، لەم نادیانەن ئەگەر بۆم بدۆزیتەوە، چەندێك بلێی پارەت دەدەینێ ،پارەمان زۆر پێیە، ( بێگومان ئەو کەسە کەسێکی موتەدەیینە بەلاَم تەنها بۆ ئەوەی سەرە داوی دەست کەوێت ئەم قسانەی کردووە ) ئەڵی ئەمجەد رۆی فایلی دەیان ساڵی پێشووی هێنا، زۆر گەڕا بەلاَم هیچی دەست نەکەوتووەوە وتوشیەتی من دەیان ساڵە لەم نادیانە کار دەکەم نەم بیستووە کچی کوردی لێ بێت.

ئەو کەسەی کە بەدواداچوونی بۆ ئەو کچانە کرد رایگەیاند، من دوای دوو بۆ سێ ساڵ گەڕان گەیشتم بەو ئەنجامەی کە ئەو کچانە ئەگەر فرۆشراشبێتن بە میسر نەبراونەتە نادی کلاپ و مەلهاو یانە شەوانیەکان، بەو پێیەی ئەوان چەند مەرجێکیان هەیە بۆ وەرگرتنی کچان بۆ ئەو شوێنانە لەوانە:

١- دەبێت شارەزاییەکی باشی لە سەماکردندا هەبێت.

٢- لەشولارێکی جوان و رێکی هەبێت.

٣- تەمەنی لە ٢٠ ساڵ زیاتر نەبێت،

٤- دەرچووی پەیمانگایەکی تایبەت بێت بەو بوارە.

٥- ئەزموونی هەبێت و ئارەزووی لەو بوارەدا هەبێت، چونکە ئەو پیشەیە لە میسر ئاساییە و بە سەدان کچ ئامادەن ئەو کارە بکەن.

بەڵام ئەو کچانە هیچ یەکێك لەو مەرجانەیان تیا نەبووە، شارەزا نەبوون، ئەزمونیان نەبووە، زۆربەیان تەمەنیان گونجاو نەبووە، چونکە دایك و کچی پێکەوە تیابووە، بە وتەی کەسوکارەکەیان ( خۆراسان عەبدوڵا تەمەنی ٥٠ ساڵ بووە عیسمەت قادر تەمەنی ٤٥ ساڵ بووە، هەر یەکەیان چەند منداڵێکیان هەبووە )

ئەو پێشی وایە میسر پێشتر دەزگای موخابەراتی زۆر بەهێز بووە هەر کەس چوبێتە ئەو وڵاتە فایلی بۆ کراوتەوە و ناوی تۆمار کراوە، بەڵام ئەو کەسە دوای سۆراغێکی زۆر هیچ هەواڵێکی ئەو ١٨ کچەی نەبیستووە، بەڵام تەنها یەك کچی هەڵەبجەیی کە لەدوای کیمیابارانی هەڵەبجە لە بەغداد بووە و شووی بە میسریەك کردووە و لەوێ چەند جارێك بینیویەتی، هاوکات خۆی دانیشتن و گفتوگۆی لەگەڵ ١٥ ژنی کورددا کردووە لە میسر کە ٢ یان خەڵکی سلێمانی بووە، بەلام ئەوان خۆیان لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠ بۆ ١٩٩٠ شوویان بە پیاوی میسری کردووە، تەنانەت هەیانە لە ٢٠١٠ شووی بە پیاوی میسری کردووە. ٧٢

ئەم رووداوە چەندین کاردانەوە و هەوڵی بەدوای خۆیدا هێنا، ڕێکخراوی چاك لە ٢٠٠٦/٤/١٢ خۆپیشاندانێکی بۆ بەردەم کونسوڵخانەی میسر لە سوید ڕێکخست، بۆ ئاشکراکردنی چارەنووسی ئەو ١٨ کچەی ئەنفال و هەڵوێستی حکومەتی میسر سەبارەت بەو پرسە، کونسوڵی میسر وەڵامێکی کورتی چاك و خۆپیشاندەران دەداتەوە بەوەی ( کە حکومەتی میسر بە ڕەسمی ئەوە بە ڕێکخراوی چاك ڕادەگەیەنێت، کە پێشووتریش لێکۆڵینەوەی سەبارەت بەو مەسەلەیە کردووە، بەڵام هیچ ڕاستیەکی تیا نیە.

**بڕوانە پاشکۆی ژمارە ١٢ دەقی بەیاننامەکەی چاك**

هاوکات ڕۆژی ٢٠٠٦/١٢/١٣ وەفدێکی چاك ( سەلاح سۆفی و قادر نادر ) سەردانی سەفارەتی میسریان کرد لە شاری ستۆکهۆڵم کە لە لایەن سەفیر و قونسوڵی میسر ( فامح فتوحی – هەیسەم موختار ) پێشوازی کران، سەبارەت بە بەڵگەنامەی فرۆشتنی کچانی کورد بە وڵاتی میسر گفتوگۆیان کردووە، داوا دەکەن بە فەرمی وەڵامی کورد بدەنەوە نەك بە زارەکی چونکە ئەوە چەندین جارە تەنها بە زارەکی وەڵام دەدەنەوە، باڵیۆزی میسر ئاماژە بەوە دەکات کە لە ساڵی ١٩٨٩ کە باس لەو دۆکیۆمێنتە دەکرێت، پەیوەندیەکانی نێوان حکومەتی میسر و بەعس زۆر خراپ بووە، دواتر وتی ئێمە ٧٥ ملیۆنین ئەوانەی لە یانە شەوانیەکانمان کار دەکەن کەم نین تا پێویستمان بەو ١٨یەش بێت، ئامادەش نین بە فەرمی و دۆکیۆمێنت وەڵامی داخوازیەکی لەم چەشنە بداتەوە. ٧٣

لێرەوە گومانی تێدا نیە کە ژمارەیەکی زۆر لە کچە ئەنفالکراوەکان بێسەروشوێنن و بەشێکی زۆریشیان نێردراون بۆ وڵاتانی عەرەبی بەڵام تا ئێستا بەڵگەیەکی ڕاستوڕوون لە بەردەستدا نیە و ئەوانەی باس دەکرێن تەنها بە قسەیە و لە بواری دۆکیۆمێنت و بەڵگەنامەی ڕاستەقینەدا لە بەردەستدا نین.

**چوارەم/ فرۆشتنی کچان بە سعودیە و سومالْ و کوەیت و ئیمارات**

لەگەڵ ئەوەی تەنها باس لە فرۆشتنی کچانی ئەنفال دەکرێت بە ولاتی میسر، بەڵام لە زۆرێك لە وڵاتانی کەنداویشدا کچی کورد هەن و زۆربەیان لە پرۆسەی ئەنفالدا گیراون و بەو وڵاتانە فرۆشراون، قادر نادر چالاکی بواری ئەنفال ئاماژە بەوە دەکات لە یەکێك لەسیمنارەکانی سەنتەری ئۆلف پالمە لە شاری ستۆکهۆڵم، بە ڕیکەوت لەگەڵ (شەهلا حەفید) ژنێکی خەلکی خانەقینم ناسی ناوی(ئەمەل) بوو باسی فرۆشتنی ئەو ١٨ کچە ئەنفالکراوانەمان کرد، وتی لەگەڵ ژنێکی سۆمالی دەرمانپێچ لە نەخۆشخانەی ئۆپساله لە سوید یەکترمان ناسی لە ساڵی ٢٠٠١ ، لە کاتی ئەوەی وتم خەلکی کوردستانم، وتی دەزانی لە گەرەکەکەی ئێمە لە ( سۆماڵیا ) زۆر ژنی کورد هەیە شوویان بە پیاوی سۆماڵی کردووە..؟؟

چەندین ژنی کورد لەسۆماڵ هەیە ؟ پرسیار ئەوەیە ، ژنی کورد لەسوماڵیا چی دەکات ؟ بە داخەوە دوای ماوەیەك زۆر هەوڵمان لەگەڵ ئەو ژنە دا کە زانیاری زیاتر لەسەر ئەو ژنە کوردانە بدات و بەدوایدا بچێت ،هاریکاری جددی نەکردین. ٧٤

زۆرێك لە دەنگوباسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لەکاتی داگیرکردنی کوەیت لە لایەن عێراقەوە کە سەربازێکی کورد ئەو کاتە لەم شەڕەدا بەشدار بووە، خوشکە ئەنفالکراوەکەی خۆی هێناوەتەوە.٧٥

تەنانەت کچی ئەنفال لە ولاتی سعودیەش بینراون، ( حاجی شەوکەت رەفعەت) مامۆستاو وتاربێژی مزگەوتی شوعلە لە شاری خانەقین، کە لەساڵی ٢٠٠٢ دا حەجی کردووە یەکێك لەکچە ئەنفالکراوەکانی بینیوە لە سعودیە، مامۆستا حاجی شەوکەت دەڵێ : ( من لەکاتی حەج کردندا لە بازاڕی مەککەدا بووم، پیاوێکی عەرەب کە زانی من کوردم وتی وەلا منیش ژنەکەم کوردە، ئەگەر حەزدەکەی بیبینی با بچین بۆ شوقەکەمان ، چونکە ئەوانیش هاتبوون بۆ حەج شوقەیان گرتبوو لەمەککە بەلام خۆیان خەڵکی (نەجد) بوون کە شارێکی سعودیە لە نزیك سنوری عێراق ، کاتێك چومە شوقەکە ئافرەتە کوردەکەم بینی تەمەنی لەنێوان ٣٠

